شوان ئەحمەد
١٠ ساڵ پاش ١١ سێپتەمبەر
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٢٥٤
چاپی یەکەم ٢٠١٢
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ١٨٥ - ٢٠١٢
نەخشاندنی ناوەوە و رازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، ئاریان ئەحمەد

ژێنک:
ژمارەی پێوانەییی ناودەوڵەتیی کتێب
ISBN: 978-9966-487-22-5

## پێرست



# ترس و تووڕەیی ئەورووپاییەکان

گزافێ دی سی. ئۆریانا ڤالاچێ. ئەندرێس بریڤیک

---

"ڕۆئاوا ئاپخانەیەکی گەورەیە"

-ئەبو قەتادە-

"درەنگ یان زوو، ئەورووپا دەبێتە کۆلۆنییەکی ئیسلامی"

-ئۆریانا ڤالاچێ-

## ساڵیادی رۆژە رەشەکە

لەمساڵدا جیهان بەگشتی و رۆژئاوا بەتایبەتی، یادی دە ساڵەی هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١ دەکەنەوە، ئەو هێرش و پەلامارە تیرۆریستییانەی زۆر شتی لە نەخشەی سیاسیی وڵاتان و شێوازی بیرکردنەوەی میللەتاندا گۆڕی.. رووداوی ئەو رۆژە رەشە هەر بە زیانە گیانی و مادییە زۆر و زەوەندەکانی پێوانە ناکرێت، هەر ئەوە نییە پەلاماری گەورەترین زلهێزی جیهانی درابێت لەناو ماڵی خۆیدا، هەر بەتەنیا کەوتنی دوو گەورە تاوەری بازرگانی نییە، لە مانهاتن و نیویۆرکدا.

زیانەکانی ئەو رووداوە هەر ئەوە نییە، توانا سەربازی و سیاسی و دارایی و سیخوڕییەکانی ئەمەریکا، بۆ تارومارکردنی مۆڵگە و هێز و کارەکتەرە دیارەکانی رێکخراوێکی تیرۆریستی وەک (قاعیدە) بەخەرج درابێت و رووبەری ماف و ئازادییەکان لە ئەوروپا و ئەمەریکا سنووردار کرابێت، بگرە لە پاڵ کۆی ئەمانەدا هەڕەشە و مەترسی گەورەی دوای رووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر لە گۆڕانی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوادایە، چ وەک نوخبەی سیاسی و رۆشنبیری، چ وەک خەڵک و خوای ئەو هەرێمە بەگشتی.

ئەوە بەڵگە نەویستێکە کە دنیای دوای کەوتنی دوو تاوەرە بازرگانییەکە، دنیای پێش ئەو رووداوە نییە، کەواتە بیرکردنەوە و رەفتار و هەڵسوکەوت و سەوداکردنیش لەگەڵ ئەوی تر و دەوروبەریشدا، بەر لە سێشەمی رەش شتێکە و دوای ئەو رۆژە شتێکی ترە.

کوشندەترین زەبری رێکخراوی (قاعیدە) کە لە هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەردا، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە موسڵمان و ئەمەریکایی و

ئەوروپاییەکانی وەشاندبێت، چاندنی تۆوی ترس و رق و بێمتمانەیی بوو، گەورەکردنی کەلێنی نێوان جیهانی ئیسلامی و ڕۆئاوا بوو... هەڵکشانی کێرڤی توندڕەوی و دەمارگیری بوو لەسەر ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەکی ترسناکی وا کە مرۆڤ لە سەدەی بیست و یەکدا، لە هیچ هەرێم و جوگرافیایەکدا هەست بەدڵنیایی نەکات و لە ژیانی خۆی مسۆگەر نەبێت.

ئەو کارەی (قاعیدە) پێی هەستا، تەنیا کوشتنی چەند هەزار کەسێکی بێتاوان و تەقاندنەوەی چەند ئامانجێکی سیاسی و ئابووری و ژیاری ولاتە یەککگرتووەکان نەبوو. پێچانەوەی ڕۆحی سێ هەزار کەس نەبوو، بنێژرێن و تەواو... خاپوورکردنی چەند شوێنێک نەبوو، دروست کرێنەوە و شتەکان بچنەوە جێی خۆیان و کۆتایی بە مەسەلەکە بێت.

ئەوەی ئەو ڕێکخراوە شەڕانگێز و مەرگدۆستە کردی، زۆر لەوە گەورەتر بوو. ئەوەتا دوای تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر ئەو کارەدا، ئاسەوارە نێگەتیڤەکانی زۆر بەزەقی دەبینین، لە هەموو جێگەیەک بۆنی رق و دوژمنایەتی و نائارامی دەکەین.. هیچ کاتێک وەکی ئەمڕۆ مرۆڤ لە کرانەوە و قبووڵکردنی ئەوی تر نەترساوە. لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە هیچ کات وەک ئێستا دەستکەوتەکانی مۆدێرنە و ڕۆشنگەری، وەک ماف و ئازادییەکان، وەک دیموکراسی و هاوڵاتیبوون و کۆمەڵگەی مەدەنی و تۆلێرانس و مافەکانی مرۆڤ، لەبەردەم هەڕەشە و مەترسیدا نەبووە... ئێستا بەئاشکرا مرۆڤ دەتوانێت رادەی ترس و ئاستی رق و تووڕەیی ڕۆئاواییەکان بخوێنێتەوە. ترس و رق لەو عەشاماتەی ناوی ئیسلامە و لە ناوەوە و دەرەوەی سنوورەکانی ڕۆئاوا، بەهەڕەشە دادەنرێن بۆ سەر ئەمەریکایی و ئەوروپاییەکان.

ئەوانەی بەکردەوە تیرۆریستییەکەی یازدەی سێپتەمبەر هەستان لە "بن

لادن" و "زەواهیری "یەوە بۆ "خالید شێخ محەمەد" و "محەمەد عەتا" و " مەروان شێحە" و "رەمزی بن شیبە"، لە چەند کەسێک زیاتر نەبوون، بەڵام ئەوەی دەبێت باجی گەورە و گرانی ئەو کردەوەیە بدات، ملیۆنەها موسڵمان و سەر ڕەش و ڕۆهەڵاتییە کە تا داهاتوویەکی دووریش، نەفرەتی "بن لادن" و (قاعیدە) لێیان نابێتەوە و وەک سێبەر بەدوایانەوە دەبێت.

لە سەروبەندی رووداوە تیرۆریستییەکەی یازدەی سێپتەمبەردا، رۆشنبیری دیاری لوبنانی "حازم اغیە" لە رۆژنامەی (الحیاة)ی لەندەنیدا، وتارێکی کورت و سەرنجڕاکێشی نووسی بەناوی (٦٧ الاسلامیین.. وفاشیة زمن العولمة) و تێیدا دەڵێت: (ساڵی ١٩٦٧ ناسیۆنالیستە رادیکاڵەکانی عەرەب دووچاریماڵوێرانییەک هاتن، ماڵوێرانییەک کە راستەوخۆ دەستی هەموویانی تێدا نەبوو، بەڵام دواجار هەر هەموویان و هەرچی عەرەبیش هەیە لەگەڵیاندا، باجی ئەو شکستەیان دا.. لە یازدەی سێپتەمبەریشدا، ئیسلامییەکان تووشی کارەساتێکی لەوە گەورەتر بوون کە ڕەنگە دەستی زۆربەیانی تێدا نەبووبێت، بەڵام دەبێت تێکڕای ئیسلامییەکان و بەر لەوانیش تەواوی موسڵمانان باجەکەی بدەن).

ئەوەی لەمڕۆدا لە پای کار و کردەوەکانی (قاعیدة)دا دەگوزەرێت ئەوەیە، ئاینێک بەهەموو مێژووی خۆیەوە، بەکارەکتەر و پرەنسیپ و ڕێورەسمەکانییەوە لەژێر پرسیاردایە. ملیارێک موسڵمان، وەک "بن لادن" و "زەواهیری " تەماشا دەکرێن.

قاعیدە و ئیسلامی توندڕۆ کارێکیان کرد، رق و تووڕەیی ئەوروپاییەکان بگاتە ئەو ئاستەی، هەرچی موسڵمان هەیە وەک تیرۆریست وێنا بکرێت و قورئان وەک (کفاحی) "ئەدۆلف هتلەر" سەیر بکرێت (بۆ نموونە خێرت فیلدەرز لە هۆڵەندا داوا دەکات، قورئان وەک کفاحی هتلەر مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت). جەنگاوەرەکانی (قاعیدە) بوونە مایەی ئەوەی زۆرێک لە

رۆژنامەکانی ڕۆئاوا، وێنەی کاریکاتێری پێغەمبەری ئیسلام بکێشن و موسڵمانانی خۆرئاوا وەک ڤایرۆسی تیرۆرو بۆمبی تەوقیتکراو سەیر بکرێن.

چەند دەیەیەک لەمەوبەر "قەشە ئۆگەستین" لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (شاری خودا) دەڵێت: (بۆ مرۆی مەسیحی واچاکترە ئازار بچێژێت، نەک ئازار بەکەسانی تر بگەیەنێت)، بەڵام لە بەراییەکانی سەدەی بیست و یەکدا و لە پای رەفتاری بەربەریانەی قاعیدەدا " گزافیێ دی سی " لەناو جەرگەی ڕۆئاوادا ڕوودەکاتە خەڵک و خوای هەمان شوێن و دەڵێت: (بۆ خۆرئاواییەکان وا چاکترە دوو دەستی رەش و چەپەڵیان هەبێت، نەک بێ دەست و دەستەوەستان بن).

راستە ڕۆئاوا یەک ڕۆئاوا نییە، یەک دەموچاوی نییە، کیشوەرێک نییە یان بڵێین دنیایەک نییە، هەمووی یەک تۆن بخوێنن و یەک جۆر بیربکەنەوە و بەیەک چاویش ببینن، لێ ئەوەی لە دوای ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەرەوە دەیبینین، هەڵکشان و زاڵبوونی رەهەندێکە کە جگە لە ترس و رق و توندڕۆیی و تووڕەیی، شتێکی دیکەی پێ نییە.

هاتنە پێشی کۆنزێرڤاتیزمە نوێیەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەو دەنگە زۆری راستڕەوە توندڕۆکان لە هەڵبژاردنی وڵاتانی ئەوروپاییدا بەدەستی دێنن، نیشانمانی دەدەن کە هاووڵاتی ئەمەریکی و ئەوروپی لە دوای یازدەی سێپتەمبەر و کردەوە تیرۆریستییەکانی تری مەدرید و لەندەندا، تا چ رادەیەک دنیابینی گۆڕاوە و چۆنچۆنی بیر دەکاتەوە لە ئێستادا.

ئەم ئیسلامە شەڕانگێزەی (قاعیدە) و گرووپە جیهادییەکانی تر نیشانی جیهانی دەدەن، ڕۆئاوای ناچار بەبیرکردنەوەی زۆر تەسک و داخراو کردووە. ترسی ئەم بەربیانە مەرگدۆستە، فۆبیایەکی خۆڵقاندووە وەک

"سلاڤیۆ ژمیژەک" دەڵێت: (کە مۆبێلیزەکردنی خەڵک لەسەر سیاسەتی ترس، ببێتە فۆرمێک لە سیاسەتی دەوڵەتی نیو لیبرال لە ئێستادا).

(قاعیدە) و هاوشێوەکانی لە دوای یازدەی سێپتەمبەرەوە، هەلومەرجێکی وەهایان خوڵقاندووە، هەموو دنیا ئیسلام و موسڵمانان بە سەرچاوەی کێشە و گرفتەکانی جیهان بزانن.

"خێرت فیلدەرز" لە گفتوگۆیەکیدا لەگەڵ کۆواری (شپیگڵ)ی ئەڵمانیدا، زۆر رووقایمانە هەرچی کێشە و گرفتی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا هەیە، دەیخاتە ئەستۆی ئیسلام و ئاوێتەبوونی کولتوورەکان. لە ئەڵمانیاشدا " تیلۆسارازین" بەهەمان نەفەسی ئەو قسە دەکات و دەڵێت: (ئەو کاتەی رێگە بە پەنابەرە بێشومارەکان دەدرێت ناسنامەی کولتووری خۆیان بپارێزن، ئەوا نەتەوەی ئەڵمان دەخەنە مەترسییەوە).

بەکورتییەکەی کەم نین ئەو دەنگانەی لە دوای یازدەی سێپتەمبەرەوە، بەپیتی درشت دەنووسن و بەدەنگی بەرز لە ڕۆژئاواوە دەڵێن: (ئیسلام هەڕەشەیە لەسەر ئازادی و ژیان و کەینوونەی ئێمە). ئەمەش وای کردووە لەسەر ئاستی میدیا و هێزی سیاسی و کۆمەڵە و رێکخراوەکانیش هەوڵی لیبراوانە هەبێت بۆ چاندنی تۆوی (ئیسلامۆفۆبیا)، لە سایکۆلۆجییەتی مرۆڤی ئەوروپایی و ئەمەریکاییدا. بێگومان ئەمە بۆخۆی دەرگا کردنەوەیە بەڕووی دۆزەخدا، لە باربردنی هەموو ئەو هەوڵانەیە کە لە رۆژگاری رێنسانس و رۆشنگەری و مۆدێرنەوە دەدرێت، بەمەبەستی پێکەوەژیان و کرانەوە و هەڵکردن و سڕینەوەی سنووره دەستکردەکان.

ئەڵبەتە لە ڕۆژئاوای دوای یازدەی سێپتەمبەردا، وەکی ئاماژەمان پێ دا، زیاد لە دەنگ و رەنگێک تەعبیریان لەو ترس و دڵەڕاوکێ و رق و تووڕەییە کردووە کە بووە بە بەشێک لە ژیانی ئەوروپاییەکان. ئەمەش لە بەرگی دەیان کتێب و تایتڵ و رووپۆشی سەدان رۆژنامە و کۆوار و بەرنامەی

چەندین گرووپ و کۆمەڵە و ڕێکخراو و هێزی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووریدا دەیبینین. هەر لە "سلڤیۆ بیرلسکۆنی "یەوە بۆ "دانیال بابیس"، هەر لە"ئەندرێس گریفەرز"ەوە بۆ "بێرنارد لویس" و "پاتریک بۆکانن" و..هتد، بەڵام ئێمە لێرەدا زۆر بەکورتی هەڵوێستی سێ کەس نیشان دەدەین کە ڕەنگە بەچاکترین شێوە، گوزارشتیان لەو ترس و تووڕەیییەی ئەورووپاییەکان کردبێت لە دوای سێشەمەی ڕەشەوە.. ئەوەی نیشانی دەدەین تەنیا ڕوویەکی ئەورووپایە و ناکرێت دیمەنی کولتووری ڕۆژئاوا بەگشتی، لە دوای یازدەی سێپتەمبەرەوە لەمانەدا کورت بکرێتەوە.

## وەسیەتنامەکەی "گزافیێ دی سی "

ڕەنگە یەکێک لەو دیکۆمێنتە گرینگانەی بەچاکترین شێوە ترس و تووڕەیی ڕۆژئاواییەکان لە دوای هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەر بۆ سەر نیۆیۆرک بەرجەستە بکات، تاقانە نووسینی دیپلۆماتکارێکی فرەنسا بێت لە واشنتۆن، بەناوی "گزافیێ دی سی " کە هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی بیرمەندی ناسراوی فرەنسایی "ڕێجی دۆبرێ " بوو. ئەگەرچی لە ڕووی فیکرییەوە جیاوازن و "گزافیێ " ڕاستڕەوێکی پەرگیر بووە و "دۆبرێ " چەپێکی توندڕۆ (ئێستا نا جاری جاران وابوو). "گزافیێ دی سی " مانگێک دوای هێرشەکانی قاعیدە، ئەم نووسینەی بە نامەیەک ئاراستەی "دوبرێ " کردووە و دوای مردنیشی لە دووتوێی کتێبێکی سەد لاپەڕەییدا بڵاو کراوەتەوە.

"دوبرێ " ئەم نووسینە بە دوا پەیام و وەسێتنامەی هاوڕێکەی ناو دەبات کە ئاراستەی ڕۆژئاواییەکانی کردووە و نەخشە ڕێگایەکی تازەیان بەردەست دەخات، تابتوانن ڕێ بەو هەڕەشە و مەترسییە جیدییانە بگرن کە ئەورووپا و ئەمەریکا لە دەسپێکی سەدەی بیست و یەکدا ڕووبەڕووی دەبنەوە.

"گزافیێ دی سی " ئەگەرچی دانووی لەگەڵ " ساموئێل هنتگتۆن"دا ناکوڵێ

و تێزه و تیۆرەکانی بەکاڵفامی فەلسەفی لە قەڵەم دەدات، بەڵام لە دوای یازدەی سێپتەمبەرەوە باوەڕ بە تیۆریاکەی دێنێ، لەبارەی ململانێ و پێکدادانی شارستانییەتەکان و پێیوایە، ئەم تیۆریایە لەگەڵ یازدەی سێپتمبەردا دەبێتە واقیع و سەرەتاکانی ئەو شەڕە دەبینین کە باسیان لێ دەکات.

ترسی ئەم کابرایە لەو رووداوە تیرۆریستییە، ترسێکی ئاسایی نییە، ترسێکە تا سەر ئێسقان سمیویەتی. وا هەست دەکات ژیاری ڕۆئاوا لەبەردەم هەڕەشەی لەناوچووندایە و کەینوونەی مرۆڤی ئەوروپایی، لەبەردەم ئەگەری مان و نەماندایە. هەر بۆیە لەو وەسێتنامەیەدا، داوا دەکات ئەورووپا و ئەمەریکا لە چوارچێوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ڕۆئاوادا یەک بگرن و بەهەردوولایان ببنە بەرەیەک بۆ بەرخوردکردن لە ژیاری ڕۆئاوا، بەرامبەر بەهەڕەشە و مەترسییەکانی ئیسلام.

ئەو پێی وایە شارستانییەتی ڕۆئاوا بە (دوورگەیەکی بچووک) دەچێت و ئەم دوورگەیەش لە هەموو لایەکەوە، بەناحەز و دوژمن و رک و کینەیەکی زۆر تەوق دراوە. بۆیە دەڵێت: (ڕۆئاوا لەم قۆناغە مێژووییەدا پێویستی بەوەیە یەک بگرێت. شارستانییەت بەر لە هەر شتێ سەنتەر و سنوورە.. شارستانییەتێک بەدوو سەنتەری ئەمەریکی و ئەوروپی، بەدوو سنووری زەریای ئەتڵەسی و دەریای سپی ناوەڕاست، ناتوانێت بەرگری لە خۆی بکات و دوژمن و ناحەزەکانی راگرێت).

"گزافێ " باس لەوە دەکات، لە رابردوودا "کرکەلا"ی ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی توانی ڕۆئاوا یەک بخات، لە ئێستاشدا ڕۆئاوا پێویستی بە "کرکەلا"یەکی دی هەیە وڵاتە یەککگرتووەکانی ڕۆئاوا (کە لە ئەمەریکا و ئەوروپا پێک دێت)، یەک بخات.

راستە ڕۆئاوا زێدی لەدایکبوونی ناسیۆنالیزم و دەوڵەتی نەتەوە بوو، بەڵام

هەنووکە دەبێت واز لەوە بێنێت و دەستبەرداری دەوڵەتی نەتەوەبێت، چونکە ئەو دەوڵەتە ئەرکی خۆی رایی کرد و ئەو قۆناغە بەسەرچوو.. ڕۆئاوا لەرابردوودا دژوارترین و خوێناویترین شەڕی لە نێوان وڵاتەکانی خۆیدا بوو، بەڵام ئەو شەڕە بێئامانەی لە داهاتوودا چاوەڕێی دەکەن لەگەڵ دوژمن و ناحەزانێکدایە کە دەکەونە دەرەوەی سنوورەکانی شارستانی خۆرئاوا.

ئەم شەڕ و ململانێ تازەیەش شەڕ و ململانێیەکی سووک و ئاسان نییە، بگرە شەڕ و ململانێی مان و نەمان، ژیان و مردنە.. ئەگەر سەدەی هەژدە سەدەی فەرەنسا بووبێت و سەدەی نۆزدە سەدەی ئینگلتەرا و سەدەی بیستیش سەدەی ئەمەریکا بووبێت، ئەوا سەدەی بیست و یەک یان سەدەی ڕۆئاوا دەبێت یان نابێت.

ئەگەرچی "گزافێ دی سی " جەخت لەوە دەکاتەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ڕۆئاوا، جگە لە دەستووری دیموکراسی دەستوورێکی تری نابێت، بەڵام ئەمە رێ لەوە ناگرێت بڵێت: (ڕۆئاوا لە ساتەوەختی ئێستادا پێویستی بەدەوڵەتێکی ناوەندی یەکگرتوو هەیە، تا ڕووبەڕووی هەڕەشە و مەترسییەکانی ئیسلام و ئیسلامیزم بێتەوە).

ترس و تووڕەیی "گزافێ دی سی " دەگاتە ئەو ئاستەی شەڕ و شەڕانگێزی بەپرۆسەیەکی رەوا بزانێت بۆ ڕۆئاواییەکان کە پەنای بەرنەبەر، بۆ خۆپاریزی لە دوژمنێکی مەرگدۆست و شەڕانگێز و پێی وایە، نابێت شەرم لەوە بکەین و لەگرتنەبەری ئەو رێگایەدا رووگیربین و دەڵێت: (وا چاکە ڕۆئاواییەکان دەستێکی رەش و چەپەڵیان هەبێت، نەک هەر دەست و مەچەکیان نەبێت). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (جورج طرابيشي: ولايات متحدة غربية أميركية + أوروبية ضد... الا سلام؟!).

بێگومان ئەمە هەر بەتەنیا رازی دڵی " گزافێ دی سی " نییە کە لەپێناو مانەوەدا و بۆ بەرگرتن بەفاشیزمێکی ئیسلامی لە بەرگی (قاعیدە)،

بەکــارهـێنانی زەبر و زۆر و تـوندوتیــژی بەکــارێکی رەوا بزانێت، ئـەوەتا فەیلەسووفێکی گەورەی وەک "ژاک دێریدا"و لە مـەراسیمی وەرگرتنی خەلاتی "ئۆدۆرنۆ"دا بەدەنگی بەرز دەڵێت: (مـن باوەڕم بەزەروورەتـی بەکــارهـێنانی توندوتیـژی هـەیە، لەپێنـاو بەرقـەرارکـردنی عـەدالەتدا). هاوتەریب بـەمـەش "تۆنی بلێر"ی سەرەک وەزیرانی پێشووتری بەریتانیـا لە دوای پەلامارەکـانی سـاڵی ٢٠٠٥ی سەر شـاری لەندەن دەڵێت: (چاکترە ناهەقی دەرهەق بەماف و ئازادییەکان بکەیت، نەک رێگە بدەیت لە شەقامەکاندا خەڵک بکوژرێت). بڕوانە: (عـبـدالرحـمن الراشـد: جـئت مـتـأخـرا يابليـر للشـرق الاوسط ٢٠٠٥/٨/٧).

بەهێـزکردنی ئەم نەفەس و تێڕوانینە لەناو جـەرگەی ڕۆژئاوادا، تیـرۆر و تۆقاندنی ئیسلامـی سیـاسی لەپشتـە، پلان و نەخشە گڵاوەکانی (قـاعیدە) تۆخـیـان دەکاتـەوە و رەواجـیـان زیاد دەکـات. کـاتێک ژیـان خـۆی لەبەردەم هەڕەشـەیەکی گەورەتردا بێت، ئەڵبەتە ئەو دەستکەوتانەی جیهانی مۆدێرن پاشەکشە دەکەن و رووبەری ئیشکردنیان بەرتەسکتر دەبێتەوە.

ئەوەی لـەمـڕۆدا جــارێکی تر ئاشـی راســتــڕەوە توندڕۆکــانی ئـەورووپا و کۆنزێرڤاتیڤـە نوێیەکانی وڵاتە یەککرتووەکانـی ئـەمەریکا دەخاتـەوە گەڕ، ئەو وتارە پڕ لە رک و کـینەیەی ئیـســلامی ئـســووڵی و ئەو رەفـتــار و کـردەوە شــەڕانگێــزانەی (قــاعــیــدەیە) کــە تەڕ و وشک پێکەوە دەســووتێنێت و دوژمنایەتی ڕۆژئاوا و جیهانی ئیسلامیش زیاتر و زۆرتر دەکات.

## کتێبەکەی "ئۆریانا ڤالاچی"

ئەگەر بۆ زۆر کەس "گزافیێ دی سی " کەسێکی گومنا و نەناسراو بێت، ئەوا بێگومـان "ئۆریانا ڤالاچی " زۆر لەوە ناسراوتر و بەناوبانگترە کە پێویستی بە ناسین هەبێت.. ئەم خانمە فلۆرەنسایییە (١٩٢٩ -٢٠٠٣) سەروو حەفتا ساڵێک ژیا، لە بواری فیکر و سیاسەت و ئەدەب و رۆژنامەنووسیدا، گەلێک

بەرهەمی دیار و دانسقەی پێشکێشی خوێنەرانی کرد.

"ڤالاچێ " ئەوەندە ژیا تا سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەک ببینێ و لە سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکیشدا لەو شارەی تێیدا دەژیا واتە (نیویۆرک) کردەوە تیرۆریستییەکانی ڕێکخراوی قاعیدە ببینێ. بینی چۆن خوێن ساردانە مرۆڤگەلێک بەناوی قەداسەت و شەهادەت و مەرگ و خواوەندەوە، ئەتکی ژیان و شارستانییەت و پرانسیپە ئینسانییەکان دەکەن. " ڤالاچێ " دیمەنەکانی ئەو کردەوە تیرۆریستییە، خەیاڵی داگیر دەکەن و ترس و تووڕەیییەکی بێسنووریشی تێدا دەچێنن. هەموو ئەمانەش دەبنە زادی فیکری نووسینی کتێبێک بەناوی (الغضب و الكبرياء).

یازدەی سێپتەمبەر مەرەکەبێکی زۆری بەنووسەران و ڕۆژنامەنوسان ڕشت، بەشێکی زۆری ئەو نووسینانەش گوزارشت لە ترس و دڵەڕاوکێ، ڕق و تووڕەیی، بوغز و شەڕانگێزی ئەو ئەوروپی و ئەمەریکاییانە دەکەن کە (قاعیدە) لە ناخەوە برینداری کردوون. بڕوانە: (لی هاریس: شارستانییەت و دوژمنانی، خێرت فیلدەرز: ئازادی هەڵبژێرە، لەگەڵ نووسینی نووسەر گەلێکی وەک: ئەندرێ گلۆکسمان و ئالان فینکلکراوت و دانیال بابیس و ف.س نایبۆل و بێرنارد لویس و بۆکانن و.. هتد).

"ئۆریانا ڤالاچێ " لە کتێبەکەیدا " (الغضب و الكبرياء) بەڕوون و ڕەوانی باس لەو ترس و تووڕەیییە دەکات و ڕەشبینی خۆی بەرانبەر داهاتووی ڕۆژئاوا ناشارێتەوە. ئەو کتێبە زیاتر بە مانیفێستێک دەچێت بۆ ئەوروپای دوای یازدەی سێپتەمبەر.. هەوڵێکە بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست، بۆ پاراستنی ژیاری ڕۆژئاوا لە دەست بەربەرییەکان و فاشیزمە نوێیەکان. نەخشە ڕێگایەکە بۆ ئەوەی خۆرئاواییەکان بزانن چۆن فاسیلەیەک لە نێوان خۆیان و ئەوان، لە نێوان ژیان و مردن، لە نێوان بەربەرییەت و شارستانییەتدا دادەنێن.

" ڤالاچێ" ترسی خۆی ناشارێتەوە لەوەی شارستانییەتی نوێی ڕۆئاوا بەهەمان دەردی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بچێت، واتە کۆچبەرە موسڵمانەکان ببنە ئەو سەرە نێزەیەی لە قەبرغەی ئەوروپاییەکان گیر دەبن و دەیانکەنە کۆیلە. ئەو تەواو بڕوای بەو تێزەیەی "ویڵ دیورانت"ی مێژوونوس هەیە کە دەڵێت: (ڕۆما هەر بەتەنیا بەهۆی شالاو و هێرشی بەربەرییەکان لە دەرەوە دوچاری شکست نەهات، بگرە ئەوەی بڕستی لێ بڕی و لاوازی کرد، نەوە و وەچەی بەربەرییەکان بوون لە ناوەخۆی ڕۆما خۆیدا).

" ڤالاچێ "ش قەناعەتی وایە گەر ڕۆئاوا فریای خۆی نەکەوێت، نەوە و وەچەی موسڵمانەکان لە ئێستادا و لە سەرزەمینی خۆیدا، بەو دەردەی دەبەن. ئەوەتا لەو کتێبەیدا دەڵێت: (درەنگ یان زوو، ڕۆئاوا دەبێتە کۆلۆنێیەکی ئیسلامی) و مەترسی خۆشی لە پرسی دیموکراسی نیشان دەدات و دەڵێت: (هەر کۆمەڵگەیەک زۆرکراوە و دیموکراسی بێت، تیرۆر زیاتر زەفەری پێ دەبات). لە پاڵ هەموو ئەمانەدا ڕۆئاواییەکان ئاگادار دەکاتەوە کە دەبێت لەم شەڕی مان و نەمانەدا (بەگژ هەموو ئەوانەدا بچنەوە کە بەهاکانی ڕۆئاوا بەسووک دەگرن).

" ڤالاچێ " وەک " پاتریک بۆکانن" پێی وایە: (کۆچی بەلێشاوی موسڵمانان بەجارێک ڕۆئاوا دەگۆڕێت و وایان لێ دەکات خاڵی هاوبەشی کولتووری و مێژوویان لە نێواندا نەمێنێ و دەستکاری پێکهاتەی دیموگرافی ئەو کیشوەرەش دەکات. ئەگەر ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەدا پەلاماری ئەفریقا و وڵاتانی ئیسلامی و جیهانی سێی دابێت و کۆلۆنیالیزەی کردبن، ئەوا ئەو وڵاتانە لە سەدەی بیست و یەکدا پرۆسەیەکی پێچەوانەی ئەوە ئەنجام دەدەن و پەلاماری ڕۆئاوا دەدەن و کۆلۆنیالیزەی دەکەن).

"ڤالاچێ" چەند لە شالاوی جەحافیلی ئیسلامی و توندڕۆی موسڵمانان دەترسێت، دە ئەوەندەش لە ڕۆئاواییەکان و هاوڕەگەزە ئەورووپییەکانی

نائومێـدە و ڕەشـبینە بەرانبـەر داهاتوو. ئەم پەرەگرافە شـەرحی ئەو دۆخـە دەروونییە خراپەی " ڤالاچیێ " دەکات کە دەڵێت: (ئەو شێرپەنجە کوشندەیەی تـووشـم بـووە دەزانم دەمـکـوژێـت، بـەڵام ڕۆژئـاوا دووچـاری دەردێـک بـووە کـوشـندەتر لەو دەردەی من، دەزانـن بۆ؟ لەبەرئەوەی هاوکـاری دوژمنەکـانی دەکـات و دۆسـتـی ئەوانـەیە کـە بەهاکـانی بـە کـەم دەگـرن. ڕۆژئـاوا نە وەک پێویست شینی قوربانییانی خۆی دەکات و نە وەک پێویستیش دەزانێت، ڕق لە دوژمنەکانی هەڵگرێت و بیان بوغزێنێت).

" ڤالاچیێ " کە ئەم شتانەی دەنووسی، تەنیا هێرشەکانی سـەر نیۆیۆرک و مانهاتنی بینیبوو، بەوە ڕانەگەیشت پەلامارەکانی مەدرید و پاریس و لەندەن ببینێت، یاخۆ لە شاشەی تی ڤی کانەوە ببینێ لە عێراقدا "زەرقاوی " چۆن بارمـتـە بیـانـییـەکـان گۆشـاوگۆش سـەر دەبڕێت. یان ئـەو هـەواڵە جـەرگ بڕە ببـیـسـتـێ کـە لە هـۆڵەنداوە باس لـەوە دەکـات، بەپێـی ئامـارەکـان چاوەڕێ دەکـرێت لـە سـاڵی ٢٠١٥دا لە هـەردوو شـاری ئەمـسـتـەردام و ڕۆتەردامـدا موسڵمانان ببنە زۆرینە. ئەو مردو ئەم هەقیقەتە تاڵانەی نەبیست. گەر بمایە بێگومـان شـان بەشـانی "رۆبرت سنبسـەر" و "بامێلاگیلەر" ڕادەوەسـتا و نەی دەهێشت لـە نزیک شـوێنی دوو تاوەرە بـازرگـانییـەکـەی مـانهـاتن، مـزگـەوت دروست بکرێت.

کتێبی (الغضب و الکبریاء) ڕەنگە بەتووڕەییەوە بیخـوێنیتـەوە و جارِست بکات، بەڵام ئەمـە ڕێ لەوە ناگرێت کە کتێـبێکە تەعبیـر لە ویژدانـی ژنێکی ئەوروپایی دەکات لە قۆناغی ئێستـادا، قۆنـاغێک کە سیـخناخـە بەتیـرۆر و تۆقاندن.

### قەتڵ و عامەکەی "ئەندرێس بریڤیک"

نزیکتـرین ڕووداو لە ئێسـتـاداو دە سـاڵ دوای یـازدەی سـێپـتـەمـبـەر کـە نیـشـانـدەری ترس و تووڕەیی ئەوروپاییـەکـان بێت لە ئیسـلام و پەنابەرانی

موسلمان لە ڕۆژئاوا، قەتڵ و عامە کەم وێنە و چاوەڕوان نەکراوەکەی "ئەندرێس بریڤیک"ە، لە ئۆسلۆی پایتەختی نەرویج لە بەرواری ٢٠١١/٧/٢٢دا.

ئەم گەنجە نەرویجییە وەک دواتر کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ئاشکرایان کرد، یەکێکە لەو دەنگانەی داوای ڕاگرتنی بەئیسلامکردنی ئەوروپا دەکەن و دژی فرە کولتووری و تەشەنەسەندنی ئیسلامن لەو کیشوەرەدا. واتە ئەمیش وەک بەشێکی زۆری ئسوولییە مەسیحییەکان و ڕاستڕەوەکانی ئەوروپا، پێی وایە ئیسلام هەڕەشەیە بۆ سەر کولتووری ڕۆژئاوا و نۆرم و بەهاکانی ئەوروپا. ئەو هەڕەشەیەش لە ڕێی گۆڕینی دیموگرافی و کۆچی بەلێشاوی خەڵکانی موسڵمانەوە مەیسەر دەبێت.

"بریڤیک" دەڵێت: (یەک وڵاتم لە دنیادا پێ بڵێن، موسڵمانان بەئاشتی و ئارامی لەگەڵ خەڵکەکەیدا بژین؟ یەک نموونەم پێ بڵێن، موسڵمانان توانیبێتیان سەرکەوتووانە لەگەڵ خەڵک و خوای ئەو شوێنانەی تێیدا دەژین ئاوێتەبن و بێ کێشە لەگەڵیاندا هەڵبکەن؟ ئاخر دەبێت چەند ئەوروپایی تر بکوژرێت و چەند ئافرەتی ئەوروپایی تر لاقە بکرێت و چەند دزی و تاڵانی تر ڕوو بدات، تا دڵنیا بین لەوەی کە ئیسلام و فرە کولتووریان نەوتووە. ئێمە با سەیرێکی لوبنان و کۆسۆڤۆ و کشمیر و تورکیا بکەین، ئەوسا دەزانین کە لە ئایندەشدا نەرویج و وڵاتانی تری ئەوروپی چییان بەسەر دێت).

ئەم قسانەی "بریڤیک" نیشاندانی هەمان ترسە، درێژکراوەی هەمان تووڕەییە.. تەعبیر لەو وەسوەسە و نیگەرانییە دەکات کە لەمڕۆدا ڕۆحی زۆرێک لە ڕۆژئاواییەکان ئازار دەدات. "بریڤیک" وەکی زۆرێک لە ئەوروپاییەکانی دی دەیەوێت ئەو مەترسییە گەورەیە نیشانی هاوڵاتیان بدات. ئەگەر "گرافێ دی سی" و "ئۆریانا ڤالاچێ" بەپێشنیاز و گازندە و گلەیی و لە ڕێی قەڵەمەکانیانەوە ئەو کارەیان کردبێت، ئەوا "بریڤیک" بەگوللە

و بەکوشتار و تەقینەوەیەکی گەورە، پەیامەکەی خۆی دەگەیەنێت.

رەنگە "بریڤیک" دوای دە ساڵ لە رووداوەکەی یازدەی سێپتەمبەر، گەشتبێتە ئەو قەناعەتەی کە قەڵەم و نووسین زۆر لەوە بێ تواناترن، ئەوروپاییەکان لەو مەترسییانە ئاگادار بکەنەوە کە تەوقی داون. هەر بۆیە ئەم وەک "گزافێ دی سی " ناکات وەسێتنامە بنووسێ، یان وەک "ڤالاچێ " کتێبێک چاپ بکات. نەخێر ئەو دێت قەسابخانەیەک دەخولقێنێ و بەناو خوێنی حەفتا قوربانیدا، ترس و تووڕەیی خۆی لە دەست موسڵمانە بەربەرییەکان بەیان دەکات. بەناو خوێنی ئەو قوربانییانەداو لەسەر لاشەی ئەو مردووانەش، پەیامی خۆی بەگوێی ئەوروپاییە چاوشین و قژ زەردەکان و موسڵمانە سەر رەشەکان و تەواوی جیهاندا دەدات.

ئێستا دنیا لە نێوان تیرۆر و تۆقاندنی ئیسلامییە ئسوولییەکان و ترس و تووڕەیی ئەوروپاییەکاندا، ژیان بەڕێی دەکات.



## ئەمەریکاییەکان و شەڕی دژە تیرۆر
## "لەپێناو چیدا شەڕ دەکەین؟"

"ئەو کەسانەی تەقینەوەکانی یازدەی سێپتەمبەریان ئەنجام دا، لەوانە بوون کە لە ئاگرە سوورەی وڵاتانی خۆیان رایان کردبوو، کەچی ئاگرە سوورەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد و ئەو وڵاتانەیان پێ سووتاند کە داڵدەیان دان و مافی پەنابەرێتییان پێ بەخشین و وەک مرۆڤ حورمەتیان گرتن".

-د. فوئاد عەجمی-

## کەس ئەمەریکای خۆش ناوێت

ئەمەریکاییەکان وان، ئەوروپاییەکان ئیرەیییان پێ دەبەن، ڕۆژهەڵاتییەکان خانەگومانن لێیان. مارکسیستەکان هەجویان دەکەن و لە هەرکوێ بێ وەک گەورە هێزی ئیمپریالیستی ناویان دێنن. ئیسلامیستەکانیش پەلاماریان دەدەن و وەک شەیتانی گەورە سەیریان دەکەن. ئەمەریکاییەکان ئەو راستییانە دەزانن، بەڵام هیچ کات وەک دوای ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر، لەسەر ئەو پرسە نەوەستاون و پرسیاری (بۆچی رقیان لێمانە؟) یان بەجیدی نەگرتووە. دوای یازدەی سێپتەمبەر، ڕۆشنبیرە دیارەکانی ئەمەریکا و ناوەندە ستراتیجییەکان و سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە و ڕاپرسیکردن، دەکەونە تیۆریزەکردنی ئەو رقە و سۆراخکردنی وەڵامی ئەو پرسیارەی کە (بۆچی رقیان لێمانە؟).

کەس ئەمەریکای خۆش ناوێت! میللەتان و هێز و کۆمەڵە و گرووپە ئایدۆلۆجی و دینییەکان.. تەنانەت زۆرێک لە هونەرمەندان و بیریاران و ڕۆشنبیران و ڕۆژنامەنووسانیش. ڕەفتار و سیاسەتی ئەمەریکا خۆی بێت، یان هەوڵی بەردەوامی هێزە مارکسییەکان بێت لە رابردوودا و ئیسلامییە ئسووڵییەکان بێت لە ئێستادا، هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە کەمترین کەس ئەمەریکاییەکانیان خۆش ناوێت.. بەدەر لە پارت و هێز و گرووپە ئایدۆلۆجییەکان، نووسەرگەلێکیش هەن بەبێ ئەوەی هیچ باکگراوندێکی ئایدیۆلۆجی و سیاسییان هەبێت و تەعبیر لە بەرنامە و گوتاری هیچ هێز و لایەنێک بکەن، ئەمەریکا وەک مەڵبەندی شەڕانگێزی و وەک دۆزەخێک وێنا دەکەن.. شاری نیویۆرک کە تەعبیرە لە ژیاری مۆدێرن و لە خەونی ئەمەریکی، "ئەدۆنیس" لە قەسیدەیەکیدا بەناوی (قبر من اجل نيويورك)

بەشارستانێتییەکی چوار پێ وەسفی دەکات و سی ساڵ بەر لە پەلامارەکەی (قاعیدە) و قوتابییەکانی "بن لادن"، باس لەوە دەکات کە رەشەبایەک لە رۆهەلاتەوە هەڵ دەکات و پەیکەری ئازادی ئەو شارە لوول دەدات. "سوهرابی سوپهەری "یش لە نامەیەکیدا دەنووسێت (نیویۆرک توخمی سەگە). رەنگە ئەدەبیاتی گەلانی تریش، پڕی بێت لە نموونەی ئەم بۆچوونانە لەسەر وڵاتی مام سام. بەدەگمەن لای ئەم یان ئەو نووسەر، بەسەر دێر و پەرەگرافی وادا دەکەوین کە ستایشی ئەمەریکا بکەن، یان ژیان و خەونی ئەمەریکایی بەدڵخوازی خۆیان بزانن. ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر و لە سەروبەندی رووخانی دیواری بەرلیندا، دیمانەیەکی نووسەری بەناوبانگی ئیتاڵی "ئیتالیۆ کالڤینۆ"م خوێندنەوە، کە تێیدا سەرسامی خۆی بە شاری نیویۆرک و ئەمەریکا نیشان دەدات و دەڵێت: (من وەک ستاندال وام زۆر عاشقی نیویۆرکم، بۆیە حەز دەکەم وەکی ئەو گەر مردم، لەسەر گۆڕەکەم بنووسن نیویۆرکی). لە دوای ئەو قسانەی "کالڤینۆ"وە، ساڵان هات و رۆیشت و ئەوەی من بینیم و خوێندمەوە، هەر پەلاماردان و هەر هێرش و هەر لاقرتێکردنی ئەمەریکا بوو. تەنانەت مرۆڤ ئەگەر واز لە هێزە ئسووڵی و توندڕەوە ئیسلامی و مارکسییەکانیش بێنێت، دەبینێت پرۆژەی نووسینی چەند نووسەرێک یەکبینە، تەرخانە بۆ هەجوکردن و مەحکومکردنی خەونی ئەمەریکی و سیاسەتی ئەمەریکی و شارستانییەتی ئەمەریکی. لەم رووەشەوە هەریەک لە "تاریق عەلی " و " ئیدوارد سەعید" و "نەوام چومسکی " باشترین نموویەکن.

شتێک کەوا دەکات هەمیشە رەخنە و تووڕەیی و رق و گلەییەکان روویان لە ئەمەریکا بێت، ئەوەیە کە ئەمەریکا وڵاتێکی مەزنە و بگرە یەکەمین هێزەی گەورەی دنیایە. هەر ئەمەش وای لێ دەکات هەرچی گۆبەن و خراپەکاری دنیا هەیە، بدرێتە پاڵ ئەو و ئەو بە بەرپرسیار بزانرێت لێیان.

کاتێک لە شوێنێکی سەرگۆی زەویدا کارەساتێک دەقەومێت و ئەمەریکا

خـۆی تێ هـەڵدەقــورتێنێت، دەبێــتــە هـەراو زەنایەکی گــەورە و بـاس لە هەژموونی ئەمـەریکا و ئیمپریالیزمی ئەمەریکی دەکرێت. کە پەناش دەگرێت و هەقی کێشـەیەکی نابێت، دەکەوێتە بەر ڕێژنەی ڕەخنـە و گلەیی ئەوەی لێ دەکرێت کە وەک گەورەترین هێزی دنیا، بە ئەرکی خۆی هەڵناستێت.

"جــۆرج تەرابیــشی" ڕاست دەکـات کـە دەڵێت: (بەدرێژایی مــێــژووی مرۆڤایەتی هیچ مۆدێلێکی ژیاری وەک مۆدێلی ئەمەریکی، ڕووبەڕووی ڕەخنە و گـازنـده و گلەیـی نەبووەتـەوە، بەڵام لـە بەرامـبــەریشــدا هیچ مــۆدێلێکی شــارســتــانی وەک شــارســتــانێـتی ئەمـەریکی، نەبووەتە بابەتی خــەونی مرۆڤایەتی). (بڕوانە، جورج طرابيشي : أمريكا التي يجدر فهمها قبل أصدار حكمنا عليها).

بەڕای ئەمەریکاناسێکی فرەنسی بەناوی "ئەندرێ گاسپی " کە پسپۆڕە لە مێژووی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمـەریکادا، بەشـێکی زۆری ئەو بەدبینییـەی لەســەر ئەمــەریکا هەیە، پێـوەندی بەوەوە هەیە کـە ئەوانەی حــوکم لەســەر ئەمـەریکا دەدەن، نایناسن و لە واقیـعی حاڵی ئەمـەریکاییـەکان بێ ئاگان... ئەمـەریکا نە ئەو ئەهریمەنە دڵڕەقـەیە کە نەیارەکانی باسـی دەکەن و نە ئەو فریشــتـەیەشــە کە لە خـەیاڵدانی هەندێکدا هەیە. ئەمریکا بەوەی زلهـێزێکی گەورەی دنیایە، دەکرێت لە هەزار و یەک گۆشەنیگاوە سەیر بکرێت. بەڵام بۆ تێگەیشتن لێی بەشـێـوەیەکی واقیــعی، دەبێت ئەم چەند بەڵگە نـەویسـتــە لەبەرچاو بگیرێت:

یەکەم: ئەمـەریکا نەتەوەی کۆچبەرەکانە (ئەگەر گونجاوبێت ناوی نەتەوەی لێ بنێین). لە مـێـژووی پڕ جـوولە و هەمـیـشــە گۆڕاوی ئـەمـەریکادا، تەنیـا شتێک کە جێگیر و نەگۆڕە، کۆچ و کۆچڕەوی بەردەوامە بۆ ئەو جوگرافیایە. شتێک لە ئەمەریکادا نییە ناوی دانیشتوانی ڕەسەنی وڵات بێت.. ئەو هندییە سوورانـەشی پێیـان دەڵێن (دانیشـتوانی ڕەسـەنی وڵات) لەجێی خـۆیدا نییـە، چونـکە ئەوانیش لەو کـۆچبــەرانەن کــە زۆر لـە کــۆنی کــۆنەوە بە گــەرووی

(بێرینگدا) پەڕیونەتەوە و داخڵ بەو وڵاتە بوون. کە وابێ ئەمەریکاییەکان بەر لە هەر شتێ جیهانێکی تایبەتین و نەتەوە نین. لەو وڵاتەدا شتێ نییە ناوی ئەمەریکی رەسەن بێت و مرۆڤێک نییە بتوانێت بەخۆی بڵێت: (سەرو مڕ ئەمەریکیم).

دووەم: ئەمەریکا وڵاتێکی دیموکراسییە. ئەم وڵاتە لە رۆژی سەربەخۆ بوونییەوە لە کاتی هاتنە دەرەوەی لەژێر دەسەڵاتی تاجی بەریتانی، جگە لە سیستەمی دیموکراسی سیستەمێکی تری نەناسیوە. ئەو دەستوورە سیاسیەشی دوو ساڵ دوای سەربەخۆیی هێنایە ئارا (واتە لە ساڵی ١٧٨٧دا)، یەکەمین دەستووری مۆدێرنەی سیاسییە لە جیهانداو هاوکات کۆنترین دەستوورێکە کە لە جیهاندا کاری پێ بکرێت.

سێیەم: ئەمەریکا وڵاتی چینی ناوەندە.. راستە ئەمەریکا وەک تێکڕایی وڵاتانی دنیا هەژار و دەوڵەمەندی تێدایە، بەڵام ئەوەی جیای دەکاتەوە لەوانی تر ئەوەیە کە لەوێدا، چینی ناوەند زۆرینەن و زۆرینەی وڵات پێک دێنن.

چوارەم: ئەمەریکا وڵاتێکی ئاینییە. دەستووری ئەمەریکا خەڵک و خوای وڵات بەیەزدان دەسپێرێ و خوا ئاگای لێیانە. دراوەکەشیان لێی نووسراوە (باوەڕمان بە یەزدان هەیە). سەرۆکی وڵاتیش کە دێتە سەر سوێند خواردن، دەبێت دەست بەئینجیلدا بدات. ئەمەریکا وەک چۆن سیستەمێکی سیاسی دیموکراسی هەیە، سیستەمی ئاینیشی دیموکراسییە، وڵاتێکی مەسیحی کاتۆلیکییە و لە ٩٥٪ خەڵکەکەی ئیمانیان بەخوا هەیە، بەڵام دینداری و خواپەرستی بۆ تێکڕای ئاین و ئاینزاکانی تریش فەراهەم کراوە.

رەنگە ئیسلامییە ئسوولییەکان زیاد لە هەر کەس و لایەنێکی دی، سوودیان لەم هەلومەرجە وەرگرتبێ و تا رووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەریش، ئەمەریکا ئەو سەرزەمینە بووبێت کە ئیسلامییە پەڕگیرەکانی دنیا، بەئارامترین شوێنیان زانیبێت بۆ خۆیان.. لە سەردەمی حوکمڕانی "بیل کلنتۆن"دا کەسێکی وەک "ئەنوەر هەدام" لەبەرەی ئینقازی

جەزائیری، بەئاشکرا دەڵێت: (لە سەردەمانی سەرەتاکانی ئیسلامدا، پاشای حەبەشە چ پشت و پەنایەک بوو بۆ موسڵمانان و بۆ سەرخستنی پەیامەکەی محەمەد، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا بیل کلینتۆنی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، هەمان ئەو ڕۆڵە بۆ ئیسلامییەکان و دۆست و لایەنگرانی هێزە ئیسلامییەکان دەبینێت). بەڵام سەرەڕای ئەوەش، کەچی ئەوانەی لە ناز و نیعمەتی ئەو شارستانییەتە بەهرەمەند بوون و لەوێدا ئۆقرەیان گرتبوو، لە بەرایییەکانی سەدەی بیست و یەکدا زۆر خوێن ساردانە، ئاگریان لەو ماڵە بەردا. "فوئاد عەجەمی " وتەنی: (ئەوان لە ئاگرە سوورەی وڵاتەکانی خۆیان هەڵاتبوون، کەچی ئاگرە سوورەکەیان لەگەڵ خۆیاندا بردو ئەو وڵاتەیان پێ سوتاند کە داڵدەی دابوون و مافی پەنابەرێتی پێ بەخشیبوون و وەک مرۆڤ حورمەتی گرتبوون).

ئیسلامیستەکان لەبەرئەوەی خۆیان بەنمایندەی خوا دەزانن لەسەر زەوی، هەر زوو بۆ خۆپاککردنەوە لەو تاوانە رایان گەیاند کە ئەوان ئەو کارەیان لەبەر خۆشەویستی خواو دین و شەریعەتی خوا کردووە، بەڵام وەکی شاعیر و ڕووناکبیری گەورە" ئەدۆنیس" دەڵێت: (ئاخر چۆن دەکرێت خوات خۆش بوێت، کەچی رقت لە بەندەکانی خوا بێت؟). ئەمە درۆیەکی گەورەیە. هەر لەسەر ئەم درۆ شاخدارەشە دوای یازدەی سێپتەمبەر، زیاتر لە شەست ڕۆشنبیر و بیرمەندی دیاری ئەمەریکی بەیاننامەیەک دەردەکەن و تێیدا، ئەم ئیدیعا بێ بناغەیەی (قاعیدە) و پیاوکوژەکانی ئەو ڕێکخراوە پووچ دەکەنەوە.

## بۆچی رقیان لێمانە و شەڕ لەپێناوی چیدا دەکەین؟

دوابەدوای هێرش و پەلامارەکانی سەر نیویۆرک و واشنتۆن لە یازدەی سێپتەمبەری ٢٠٠١دا، ئەمەریکا وەک دەوڵەت و وەک دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و تێکڕایی خەڵکانی ئەو وڵاتە کەوتنە خۆ. هەم بۆ بەرگرتن و بەرپەرچدانەوەی ئەو هێز و لایەنانەی بەو کارە هەستاون و گرتنەبەری ڕێوشوێنی سیاسی و سەربازی و ئەمنی لە دژیان، لەگەڵ هەوڵی

بێـوچانیش بۆ تێگەیشتن لەوەی کـە رووی دا و تیـۆریزەکـردنی ئەو رق و تووڕەییـیـەی بوونە مـایەی ئەوەی لە مـاوەیەکی کـورتدا، ئەمـەریکا لەناو جەرگەی وڵاتەکەیدا و بە بەرچاوی دنیاوە سێ هەزار قوربانی بدات.

ئەگەر بەشێکی کارە سیاسی و سەربازی و سیخوڕییەکان ئەمەریکا وەک دەوڵەت پێی هەسـتـابێت، ئەوا بەشـەکـەی تری کـە تیـۆریزەکـردن و بەدواداچوونی حـاڵەتەکە و هەوڵدان بوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسـیـاری (بۆچی رقیـان لێمـانـە و لەپێناو چیدا شـەڕ دەکەین؟)، سـەنتـەرەکانی تـوێژینەوە و ناوەندە ئەکادیمی و ستراتیـجییەکان و توێژی رۆشنبیران و میدیاکاران پێی هەستان و لەو پێناوەشدا هەوڵێکی زۆریان بەخەرج دا.

واتە وەک وڵاتانی ئێمـە، تەنیـا دەوڵەت و دەسەڵاتی سیـاسی مـەعنی نەبوون، بەوەڵامـدانەوە بەو رووداو و کـارەسـاتە چاوەڕوانـنەکراوە، بگرە لەگەڵیـشـیـدا توێژی رۆشنبـیران و مـیدیکاران و ئەکادیمیسـتـەکان و رۆژنامـەنووسـان کە بەرهەمـهـێنەری مـەعریفە و زانیـارین، شـانیـان دایە بەر ئەو کـارە و بەشـێکی بەرپرسیارێتی رووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییـانەیان خستە ئەستۆی خۆیان.

ئەو بەیاننامـەیەی کە شەست لە رۆشنبیرانـی ئەمەریکا، لە دوای رووداوەکـانی یازدەی سـێپـتـەمـبـەر بڵاویان کـردەوە، نموونەیەکـە. ئەو نـامـەیـە بەیەکـێک لە تێکستـە گرینگەکانی ئەو قۆناغـە ئەژمـار دەکرێت و واژۆی چەندین نووسـەر و بیـریاری دیار و گـرینگی ئەمـەریکای لەسـەرە، لەوانە: (فـرانسـیس فـۆکـۆیامـا، سـاموئیل هنتنگـتۆن، هـارڤی مـانسفـێڵد، سـامـوئێل فریدمـان، تۆماس کوهلەر، رۆبەرت بۆتمان، جێرارد برادلی، پۆڵ ڤیتز، نیڵ گیلبەرت و.. هتد).

ئەڵبــەت ئەم نامــەیە لە کــاتی خــۆیدا و تا ئەمــڕۆش، بۆ زۆربەی زۆری زمـانەکان تەرجـەمـە کراوە و قـسـە و باسـی زۆریشی خـسـتـووەتەوە، بەڵام بێگومان لە رۆشنبیری کوردیدا نە نامەکە چانسی تەرجەمەکردنی هەبوو، نە قسە و باسی پێویستی بەدوای خۆیدا هێنا. بێگومان ئەمە شتێکی عادەتییە و کـەم جـار بووە، رۆشنبـیـریی کـوردی وەک پێـویست ئاوڕی لە رووداو و

مەسەلە جیهانییە گرینگەکان دابێتەوە و قسەی لەسەر کردبن.

بەهەر حاڵ، بەو پێیەی ئەوانەی هێرش و پەلامارەکانیان ئەنجام دابوو (عەرەب و موسڵمان) بوون، هەر بۆیە بەشێکی زۆری نووسراوەکەیان رووی لە (عەرەب و جیهانی ئیسلامی) بوو. لێرەوە عەرەب و ئیسلامییەکان (ئەوەندەی من ئاگادارىم)، زۆرترین شتیان لەسەر بەیاننامەکەی رۆشنبیرانی ئەمەریکی وت. بێگومان لە دەرەوەی ئەم بەیاننامەیەشدا، رۆشنبیران و ئەکادیمیستانی تری ئەورووپا و ئەمەریکا، لە سۆراخکردنی وەڵامێکدا بوون بۆ پرسیاری (بۆچی رقیان لێمانە؟). رەنگە زۆر پێشتر وتارەکەی "بێرنارد لویس"، بەناوی (رەگوریشەکانی رق و توورەیی ئیسلامی) یەکێک بێت لەوانە. "بێرنارد لویس" وەک رۆژهەڵاتناسێکی قاڵبوو و پرئەزموون، وتارەکەی بەم پرسیارە دەست پێ دەکات: (بۆچی زۆربەی موسڵمانان، رقیان لە رۆژئاوا دەبێتەوە؟). ئەڵبەت "بێرنارد لویس" بەدوور و درێژی لەسەر هۆکارەکانی ئەم رق و توورەییە دەوەستێت و باسیان دەکات، بەڵام پوختەی قسەکانی و قەناعەتی خۆی ئەوەیە کە (جیهانی ئیسلامی لە ئێستادا دوچاری شکست و قەیران و هەڵخلیسکانێکی گەورە بووە و لە قوربانییەک دەگەڕێت، تا هەموو ئەو شتانەی بخاتە ئەستۆ).

واتە جیهانی ئیسلامی بۆ خۆدزینەوە لە بەرپرسیارێتی زۆربەی زۆری ئەو کێشانە و دوورخستنەوەی لە خۆی، لە قوربانییەک دەگەڕێت یان بڵێین بۆ هێزێک دەگەڕێت لە دەرەوەی خۆی، تا هەموو شتەکان بکاتە ملی ئەو. بەگشتی لە دنیایەکدا کە (دین تێیدا بووبێت بە ڤایرۆسێکی کوشندە و ماڵوێرانکەر و مەترسی لە چەکی کۆمەڵکوژ زیاتر بێت، بەناچاری دەبێت بەرپەرچ بدرێتەوە و شەڕی لە دژی رابگەیەنرێت). (بڕوانە، علي حـرب: السفير الثقافي ٢٠٠٨/٤/٨).

هەر لەم سەروبەندەشدا کاتێک ئەمەریکا دێتە سەر خەت و بۆ ئیعتبار گێڕانەوە بۆ کەرامەتی پێ لێنراوی جەنگی (دژە تیرۆر) رادەگەیەنێت، ئەو

شەست رۆشنبیرەی ئەمەریکا لە بەیاننامەیەکدا مەبەست و هۆکارەکانی ئەو جەنگە بۆ هەموو لایەک روون دەکەنەوە و دەسپێکی بەیاننامەکەشیان بەمە دەست پێ دەکەن: (لەپێناو چیدا شەڕ دەکەین؟).

لەوەلامدا دەڵێن: (هەندێ جار ئان و ساتی وا دێتە پێشێ، نەتەوەیەک ناچار دەبێت بەزەبری چەک بەرگری لەخۆی بکات. لەبەرئەوەشی کە شەڕ پرسێکی مەترسیدارە و قوربانی لێ دەکەوێتەوە و پێوەندی بە بەنرخترین شتەوە هەیە کە ژیانی مرۆڤە، ئەوا پێویستە لە سەر ئەوانەی جەنگ رادەگەیەنن، باس لەو مۆراڵانە بکەن کە دەبێتە پاشخانی کارەکەیان و تەواوی دنیا لە راستی و دروستی ئەو پرەنسیپانە ئاگەدار بکەنەوە کە لەپێناویدا دەجەنگێن. بۆیە ئێمە لێرەدا تەئکید لە چەند هەقیقەتێکی نەگۆڕ و بنەمایی دەکەینەوە کە پێوەندی بەتێکڕایی مرۆڤەکانەوە هەیە بەبێ جیاوازی، ئەو هەقیقەتانەش ئەمانەن:

١- مرۆڤەکان وەک یەک رێز و مافیان هەیە، بەبێ جیاوازی.

٢- مرۆڤ رەگەزی سەرەکی پێکهێنەری کۆمەڵگەیە و شەرعیەتی فەرمانڕەواش لە پاراستنی ئەو بوونەوەرەدایە، لەگەڵ رەخساندنی هەلی پێویستدا بۆی، تا تواناکانی خۆی تاقی بکاتەوە و بەڕووی دنیادا بکرێتەوە.

٣- مرۆڤ بە سروشتیی خۆی حەزی بە سۆراخکردنی ئامانج و مەبەستی ژیان هەیە.

٤- ئازادیی ویژدان و ئازادی ئاینی، لەو مافانەن کە نابێت لە مرۆڤ زەوت بکرێن.

٥- کوشتن بەناوی یەزدانەوە، پێچەوانەی بڕوا هێنانە بەخوا و خیانەتی گەورەیە لە یۆنیڤێرسالییەتی ئیمانی ئاینی.

بەم پێیە ئێمە بۆ خاتری بەرگریکردن لە خۆمان و لەم پرەسپە یونیڤێرسالییانە شەڕ دەکەین).

ئەو شتەی لە دوای یازدەی سێپتەمبەرەوە، ئەمەریکاییەکان ئازار دەدات و گێنگڵ دەدەن پێیەوە، ئەو پرسیارەیە کە لە یەکتری دەکەن و بێ وەڵامە: (بۆچی ئێمە دوچاری ئەم هێرش و پەلامارە پڕ لە رق و شەڕانگێزیە بووین؟). (ئەوانە بۆ تا ئەو ئەندازەیە رقیان لێمانە و بۆچی بەخوێنی سەرمان تینون؟).

وەک وەڵامێک بەم پرسیارانە، ئەو نووسەرانە دەڵێن: (ئێمە دان بەوەدا دەنێین کە نەتەوەی ئێمە لە هەندێ کاتی دیاریکراودا، خوێنسارد و نابەرپرسیارانە بەرانبەر میللەتانی تر رەفتاری کردووە، لەوانەش گرتنەبەر و پەیڕەوکردنی سیاسەتی چەواشەکاری و ناعادیلانە. ئێمە زۆرجار نەمانتوانیوە کار بەو ئایدیا و قەناعەتانە بکەین کە بڕوامان پێیان بووە، بۆیە ناکرێت گەلانی دی ناچار بکەین بەوەی پابەندی ئەو پرەنسیپە مۆراڵییانەبن کە ئێمە بۆ خۆمان زۆر کات نەمانتوانیوە پابەندبین پێیانەوە و راستگۆیانە کاریان پێ بکەین، بەڵام ئێمە پێمان وایە و دڵنیاشین تەواوی خێرخوازانی جیهانیش هاوڕان لەگەڵماندا کەسیاسەتی دەرەکی وڵاتی ئێمە هەر چۆنێک بووبێت، پاساو نییە بۆ ئەوەی خەڵکی بێ تاوان قەتڵ و عام بکرێن و بەو دەردە ببرێن.

بەو پێیەشی کە تیرۆریستانی یازدەی سێپتەمبەر هیچ داواکارییەکی تایبەتییان نەبووە، کەواتە ئامانج لە تاوانەکەیان هەر کوشتن و قەتڵ و عامکردن بووە و هیچی تر. سەرکردەی رێکخراوی قاعیدە ئوسامە بن لادن دان بەوەدا دەنێت کە هەڵمەت و پەلامارە پیرۆزەکانی یازدەی سێپتەمبەر بۆ سەر ئەمەریکا، لەو قەناعەتە نەگۆڕەیانەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو وڵاتە سەری گەورەی کوفری جیهانییە. ئەم قسانە بەڕوون و رەوانی دەری دەخەن، پەلاماردەرەکان هەر بەتەنیا رقیان لە حکوومەت و دەسەڵاتە سیاسییەکەمان نییە، بگرە شێوازی ژیانکردن و تەواوی کۆمەڵگاکەمان بەسووک دەگرن و داخ لە دڵن لێمان. واتە ئەوان تەنیا لە رەفتاری سەرکردە و بەرپرسەکانمان تووڕەنین و رقیان بەتەنیا لەوان نییە، بگرە لە ئێمە هەموومانە، وەک

ئەمەریکایی بەگشتی). ئێمە وەک ئەوانەی واژۆی ئەم بەیاننامەیەمان کردووە و وەکی زۆرێک لە ئەمەریکاییەکانیش پێیان وایە، راستە هەندێ نۆرم و بەها لە کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا هەن جوان نین و بگرە زیانبەخشیشن، وەک: (بەر خۆری بێ حیساب و ئازادیی بێ سنوور و فەردگەرایییەک بێ منەت لە وانی دی و لە کۆمەڵگە و پاشەکشەکردنی هاوسەرگیری و بەرتەسکبوونەوەی ژیانی خێزانی و...هتد)، بەڵام ئەمانەش بەهانە نین تا بەو شێوەیە پەلامار بدرێین.. ئەرکی ئێمەیە گەر یازدەی سێپتەمبەریش نەبوایە، بەر بەو دیاردە دزێوانەی ناو کۆمەڵگە بگرین و لە بەرانبەریشدا تەئکید لە کۆمەڵە نۆرم و بەهایەکی تری ئەمەریکی بکەینەوە کە نەک تەنیا بۆ ئەمەریکاییەکان، بگرە بۆ تەواوی جیهان سوودی دەبێت و خێر دەداتەوە.

ئەوەی لەم مەسەلەیەدا ئێمەی دڵگران کردووە و بەڕەوای نازانین، ئەوەیە کە خەڵکانێک رێ بەخۆیان دەدەن بەناوی خواو بەناوی بەها ئاسمانییەکانەوە، بمانکوژن و دەستدرێژی بکەنە سەرمان، لە کاتێکدا ئێمە پێمان وایە تەوزیفکردنی خوا و دەسەڵاتی ئاسمانی بۆ کوشتن و رۆح کێشانمان، کارێکە دوورە لە ئەخلاق و پێچەوانەی بڕوابوونە بە خوا، چونکە کەس لە ئێمە پێی وانییە یەزدان داوا لە هەندێکمان بکات ئەوانی تر بکوژین و رقمان لێیان بێتەوە. لە راستیدا هەرکەس ئەم کارە بکات ئیتر بەناوی جەنگی پیرۆزەوە بێت، یان بەناوی هەڵمەتی خاچ پەرستانەوە بێت، دژی بیروباوەڕی ئاینی دەوەستێتەوە، نەک تەنیا دژایەتی پرەنسیپە سەرەکییەکانی عەدالەت بکات، چونکە ئەوەی ئەو کارە دەکات خوا دەکات بە بتێک، تا هەندێ کەس بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەکاری بهێنن.

ئەوانەی پەلاماری ئێمەیان دا لە یازدەی سێپتەمبەردا، بەدەنگی بەرز و پڕ ئاشکرا دەڵێن: (ئێمە جەنگی پیرۆز دەکەین و ناوی خوا بەکاردێنین). ئاخر ئەمە چ بیرکردنەوەیەکی نەزۆک و سەقەتە. ئەم بوغز و بەدگومانی و رق و شەڕانگێزییەی لە سەدەی بیست و یەکدا بەناوی ئاینەوە ئەنجام دەدرێت،

دەرەنجامی زۆر ترسناکی دەبێت گەر رێی پێ نەگیرێت. بۆیە دەبێت بەجیدی بیر لەم مەسەلەیە بکەینەوە.

ئێمە دەزانین شەڕ پرۆسەیەکی ترسناکە و دواجار تەعبیرە لە شکستی مرۆڤی سیاسی، بەڵام هەندێ ئان و سات دێتە پێشێ، راگەیاندنی شەڕ نەک هەر کارێکی ئەخلاقی دەبێت، بگرە گرینگ و پێویستیش دەبێت، بۆ بەربەرچدانەوەی کارەساتێک کە دەستی رق و کین و بوغز خوڵقاندوویەتی. کاتی ئێستاش ئەو چرکە ساتەیە. ئەو هێزەی ئەمڕۆ سەنگەری لێ گرتووین و هەڕەشەمان لێ دەکات، دەیەوێت تارومارمان بکات نەک شتێکی دی، هەر بۆیە لە وەها حاڵەتێکدا پەنابردن بۆ هێز پاساوی ئەخلاقی خۆی دەبێت.

ئەوانەی لە یازدەی سێپتەمبەری ٢٠٠١دا، پەلاماری نیویۆرک و واشنتۆن و پەنسلڤانیایان دا و لە ماوەی کەمتر لە دوو کاتژمێردا، سێ هەزار هاوولاتی بێتاوانی ئێمەیان کوشت، تەنیا تاوانیان هەر ئەوەبوو کە ئەمەریکی بوون و لەسەر خاکی ئەمەریکا دەژیان. ئەوانەی ئەم تاوانانەیەن ئەنجام دا، خۆبەخۆ و لە خۆڕا و بێ پلان و بێ پشتگیری ئەو کارەیان نەکردووە، بگرە ئەوانە کەسانێک بوون ئەندام بوون لە رێکخراوێکی ئیسلامیی نێودەوڵەتیدا کە لەناو چل ولاتی جیهاندا دەستبەکارە و پێی دەڵێن (قاعیدە). ئەم رێکخراوە کوشتن و تیرۆر و تۆقاندنی کردووەتە ستراتیج، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی.

ئەم رێکخراوە بەناوی ئیسلامەوە قسە دەکات و رق و کینەی خۆی دژی ئەمەریکاییەکان بەیان دەکات، بەڵام لە راستیدا خیانەت دەرهەق بە بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام دەکات، چونکە ئیسلام دژی ئەو کردەوە نا ئەخلاقی و دڕندانەیەیە. راستە ئەم بزووتنەوانە جبەی ئاین لەبەر دەکەن بۆ مەبەستی تر، بەڵام دەبێت وریایان بین و چاوپۆشی لەو پرسە فەلسەفییانە نەکەین کە دەبنە زادی ئەم بزاوتە ئیسلامییە رادیکالانە. وەک سەیرکردنی ژیانی مرۆڤایەتی و بینینی ژیان وەک سەرزەمینی ململانێی نێوان بڕوادار و

کافرەکان، یان لە قەڵەمدانی ڕێزگرتن لە مرۆڤەکان بەیەکسانی و چون یەک، بەکوفرێکی گەورە. ئەو بزووتنەوانە بەم کارەیان خیانەت لە ئاین دەکەن و گورزی کوشندەش لە پایەکانی ژیانی پێکەوەیی و ئاشتی گەلان دەوەشێنن.

ئەوانەی هاتن بەوپەڕی خوێن ساردییەوە، ڕۆحی سێ هەزار کەسی بێتاوانیان بەدزێوترین شێوە پێچایەوە، لە ئێستا و داهاتووشدا ئامادەن هەمان شت دووبارە بکەنەوە، بۆیە دەڵێین: (ئەوانە مەترسییەکی گەورەن نەک تەنیا بۆ سەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بگرە بۆ سەر تەواوی خێرمومەندانیش لە جیهاندا). ئێمە دەمانەوێت لە ڕێی ئەم پەیامەوە، دەنگمان بگاتە تەواوی خوشک و براکانمان لە وڵاتانی ئیسلامی و ڕێک و ڕاست پێیان بڵێین: (ئێمە دوژمن نین و دۆست و هاوڕێین، نابێت دژایەتی یەکتر بکەین. خاڵی هاوبەش لە نێوانماندا زۆرە و زۆر شت هەیە بۆ ئەوەی پێکەوە بیکەین. ڕێز و حورمەتی مرۆڤانەتان، هیچی لە هی ئێمە کەمتر نییە. ماف و هەلی ئێوەش بۆ ژیانێکی نوێ، لە ماف و دەرفەتی ئێمە کەمتر نییە و ئێمە لەپێناو ئەمەدا دەجەنگین. دەزانین هەندێک لە ئێوە لێمان بەگومانن و ئێمەش وەک خەڵکی ئەمەریکا دەزانین، بەشێک لەو بەدگومانییە بەئەستۆی ئێمەیە، بەڵام نابێت دوژمنی یەکتری بین. هیوادارین لەگەڵ ئێوە و تەواوی خێرخوازانی جیهاندا، هاوکار بین بۆ هێنانەدی ئاشتییەکی ڕەوا و هەمیشەیی).

لە دوای یازدەی سێپتەمبەر و لەگەڵ دەسپێکردنی شەڕی دژە تیرۆردا، شتێک هاتە پێش لە جیهاندا بەناوی (شەڕی خۆ بەهەقزانی). واتە هەرلایەنێک لە شەڕەکە، خۆی لەسەر هەق و شەڕەکەی بەشەڕی ڕەوا دەزانێت. (قاعیدە) بەناوی خواو دین و بەشمەینەتانی جیهانی ئیسلامییەوە و ئەمەریکا و ڕۆژئاواش، بەناوی پاراستنی ئاسایش و ئارامیی جیهان و ڕاماڵینی تیرۆریستانەوە. واتە ئێستا جیهان لەبەردەم شەڕی دوو بەرەی خۆ بەهەقزاندایە، لەوێشدا کە پێمان وایە ئێمە لەسەر هەقین، وەکی شاعیری ئیسرائیلی "یەهودا ئامیچای" دەڵێت: (هیچ گوڵێک ناڕوێت!).



# ئەمەریکا لە چاوی (سەید قوتب و قاعیدە)وە

"موسڵمانان، با کار بۆ ئەوە بکەین رق و بوغز و رۆحی تۆڵەسەندنەوە، لە ناخی ملیۆنان خەڵک و خوای خۆماندا بچێنین. با هەر لە منداڵییەوە فێریان بکەین کە پیاوی سپی دوژمنی مرۆڤایەتییە. پێویستە هەڵێکمان بۆ رەخسا، ئەو بوونەوە دە تارومار کەین. با دڵنیاش بین لەوەی کە کۆلۆنیالیزمی ئەوروپایی، سەروەختێک دەبینێ ئێمە ئەم تۆوی رق و بوغز و تووڕەیی و تۆڵەسەندنەوە لە ناخی نەوەکانماندا دەچێنین، ترس دای دەگرێت و پەلوپۆی دەشکێ".

-سەید قوتب-

## ئەمەریکا وەک ئەهریمەن

ئەدەبیاتی ئیسلامی سیاسی لە ڕۆژگاری "حەسەن بەننا"وە تا ساتەوەختی ئێستای (قاعیدە) و هاوشێوەکانی، پڕیەتی لە وێنەی دزێو و ناقۆڵای ڕۆژئاوا. وێنە بەدەکانی ئەمەریکا و ئەوروپا، زۆر بەئاسانی لەناو دێر بەدێری بەرنامەی کاری فێندەمێنتالیستە ئیسلامییەکان و نووسین و بەرهەمی تیۆرسینەکانی ئیسلامی سیاسیدا دەدۆزینەوە.

وێنەی ڕۆژئاوا لە خەیاڵدانی ئیسلامیستەکاندا، وێنەی هەرێم و جوگرافیا و شارستەنییەتێکە، لێوان لێوە لە کوفر و گومڕایی و بەدڕەوشتی. وێنەی دنیایەکە، ناحەز و دوژمن بەئیسلام و بەخەڵکانی موسڵمان و بەشەریعەت و بەرنامەی خوا لەسەر زەوی. وێناکردنی ڕۆژئاوا وەک ئەهریمەن و دڕندەیەکی بێئامان، وەک شارستانییەتێکی چاوچنۆک و پاوانخواز و بێ مۆراڵ، لەمڕۆدا و لای زۆربەی زۆری ئەندام و لایەنگرانی ئیسلامی سیاسی، بووەتە هەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگر. ئەو وێنە زەهنییانە شوێنی وێنە واقعیەکانیان گرتووەتەوە و ئەوەی لە زەینی ئیسلامیستەکاندا چەسپیووە لەسەر ڕۆژئاوا، جێگەی بەخۆرئاوای ڕاستەقینە و ڕۆژئاوای واقیعی لەق کردووە.

مرۆڤ کاتێک بە بەشێکی کەمی ئەدەبیاتی ئیسلامی سیاسیدا دەچێتەوە، تێ دەگات بۆچی کارەساتێکی وەکی یازدەی سێپتەمبەر دەقەومێت. حاڵی دەبێت چۆن خەڵکگەلێک بە کەماڵی ئیسراحەت و بەوپەڕی خوێن ساردییەوە، چەند فڕۆکەیەکی پڕ لە سەرنشینی مەدەنی دەفڕێنن و دەیکەن بەناو دوو تەلاری بازرگانیدا و گەورەترین قەسابخانە دەقەومێنن.

ئەو مرۆڤەی بەو کتێب و نووسراوانە گۆش بکرێت، ناتوانێت تەندروستانە

مامەڵە لەگەڵ دنیایەكدا بكات كە وڵاتەیەككگرتووەكانی ئەمریكا و وڵاتانی ئەورووپی و نۆرم و بەهای ئەو شارستانییەتەی تێدابێت. نیشاندانی ڕۆژئاوا وەک سەرزەمینی كوفر و موتڵەق و بەدڕەوشتی بێ حەد و حیساب، وێناكردنی ئەمەریكا وەک شەیتانی گەورە و دوژمنی سەرسەختی ئیسلام و ئەخلاق و ترادسیۆنی ڕۆهەڵاتی، ئەوەیەک دروست دەكات سەرشار بەر رق و توورەیی. خەڵكانێک پێی دەگەیەنێت دنیا بكەنە دوو بەش (بەشێكیان سەرزەمینی ئیمان و ئیمانداران، لەگەڵ بەشێكی تردا كە خاكی گومڕا و كافر و سەرلێشێواوەكانە).

(قاعیدە) وەک رێكخراوێكی ئسوولیی توندڕۆ، هەر بەتەنیا بەئەقڵی "ئەیمەن زەواهیری " بیرناكاتەوە و بەپلان و بەرنامەی "بن لادن" و "سەیفولعەدل" و "ئەبوحەفسی میسری " و "ئەبولەیسی لیبی " ناچێت بەڕێوە... (قاعیدە) بەدەر لەوانە، لەسەر میراتییەكی گەورە دەژی كە لە تیۆرسێن و هەڵسووڕاوەكانی ئیسلامی سیاسییەوە بۆیان جێماوە، هەر لە"حەسەن بەنا و سەید قوتب"ەوە تا دەگاتە " ئەبو ئەعلای مەودودی و ئەبو حەسەنی نەدەوی ".

میراتی ئەمانەیە، دەستی لە دیاریكردنی چۆنیەتی بیركردنەوەی جەنگاوەرانی (قاعیدە) و فۆرمەلەكردنی دنیابینی ئەندامان و هەوادارانی ئەو رێكخراوەدا هەیە.

ژێرخانی دید و تێڕوانینی (قاعیدە) بۆ ئەمەریكا و ڕۆژئاوا بەگشتی، برێتییە لە تێزە و تیۆرە و بۆچوونەكانی "سەید قوتب" و "ئەبوئەعلای مەودوودی ".. ئەو چاوەی قاعیدە دنیای تازە و رۆڵی ئەمەریكا و شارستانییەتی ڕۆژئاوای لە جیهاندا پێ دەبینێت، هەمان ئەو چاوەیە كە پێشتر و نیو سەدە بەر لە ئێستا، "سەید قوتب" لێیەوە سەیری دنیای پێ كردووە.

دۆزینەوەی ئەم پێوەندییە و بینینی ئەم نزیکایەتییە، لە نێوان تیزە و تیۆرەکانی تیۆرسینێکی پەرگیری ئیسلامی وەک "سەید قوتب" لەگەڵ ڕێکخراوێکی تیرۆریستی و توندڕەوتی وەک (قاعیدە)دا، زۆرشیمان لەسەر نهێنیی هێرش و پەلامارەکانی سەر نیۆیۆرک و واشنتۆن و پەنسلڤانیا لە یازدەی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١دا پێ دەڵێت.

## "سەید قوتب" لە ئەمەریکا

ساڵانی دوای دووەم جەنگی جیهانی، وەزارەتی مەعاریف لە میسر، یەکێک لە فەرمانبەرەکانی خۆی رەوانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکات، تا لە نزیکەوە راپۆرتێکیان لەسەر سیستەمی پەروەردە و خوێندنی ئەو وڵاتە بۆ ئامادە بکات و بتوانن بە سوودوەرگرتن لە ئەزموونی خوێندنی ئەمەریکاییەکان، بارودۆخی سیستەمی پەروەردە و فێرکردن لە میسردا چاکتر بکەن. ئەو فەرمانبەرەش "سەید قوتب" (١٩٠٦ - ١٩٦٦) دەبێت.

"سەید" ئەگەرچی ماوەی چەند ساڵێک لەو وڵاتەدا دەمێنێتەوە، بەڵام ئەوەی نایکات ئەو شتەیە کە بۆی چووە. ئەو وەک کەسێکی لیبراڵ و عەلمانی و ئەدیب و شاعیرێک خۆی دەکات بە ئەمەریکادا، کەچی لەو سەر کە دێتەوە دەبێتە مرۆڤێکی ئسووڵی ئیسلامی و تیۆرسین و هەڵسووڕاوێکی دیاری ئیخوان موسلمین.

ماجەراو پوختەی ئەم سەفەر و گۆڕانکارییە ریشەییانە لە کارەکتەری ئەو پیاوەدا، بەچاکترین شێوە لە کتێبەکەی "د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالدی "دا دەخوێنینەوە. رەنگە بەدرێژایی نیو سەدەی رابردوو، زۆر شت لەسەر "سەید قوتب"و ئەمەریکا و مانەوەی ئەو لەو وڵاتەدا نووسرابێت و باس کرابێت، بەڵام هیچ یەک لەوانە بەو شێوە تێروپڕییەی کتێبەکەی "ئەلخالدی " نین.

کتێبەکەی لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

بەشی یەکەم/ "سەید قوتب" لە ئەمەریکا.

بەشی دووەم/ هەڵسەنگاندنی "سەید قوتب" بۆ ئەمەریکا.

بەشی سێیەم/ قسە و باسەکانی "سەید قوتب" لەسەر ئەمەریکا.

ئەڵبەت لێرەدا ئێمە ناتوانین یەک بەیەک لەسەر ئەو بەشانە بوەستین و بیانخەینە ڕوو، بەڵام ئەوەی لە پوختەی خوێندنەوەی کتێبەکەدا دەستگیرمان دەبێت، ئەوەیە کە پیاوێک دوای مانەوەی چەند ساڵێک لە وڵاتێکدا، بەکۆمەڵێک ڕق ئەستووری و گرێی دەروونی گەورە دەگەڕێتەوە و هەموو ئەو شتانەش بەنووسین بەیان دەکات. ئیتر لە ڕێی نووسینی وتار و نامەوە بێت، یان بە چاپکردنی کتێبێک بێت بەناوی (ئەو ئەمەریکایەی من بینیم).

ڕاستە لە سەردەمی "جەمالەدینی ئەفغانی " و " شێخ محەمەد عەبدە" و "شێخ ڕەشید ڕەزا" و "حەسەن بەننا"وە، ڕۆژئاوا و شارستانییەتی ئەمەریکی شوێن ڕەخنە و گازندە و گلەیی جیهانی ئیسلامی بووە، بەڵام هیچ کات وەک ساتەوەختی "سەید قوتب" ئەو ڕەخنە و ناڕەزاییانەی، نەگۆڕاون بۆ ڕقێکی کوێرانە و نەبوونەتە دوژمنایەتیکردنێکی ڕوون و ئاشکرا.

ئەو گوتارە ئایدیۆلوجییەی "سەید قوتب" لەسەر شارستانییەتی ڕۆژئاوا وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بەرهەمی دێنێ، گوتارێکە لەسەر ڕق و شەڕانگێزی و سڕینەوەی ئەوی دی داڕێژراوە. گوتارێکە وێنەی دوژمنێکی ناحەز و ئەبەدی بەڕۆژئاوا دەبەخشێ و نەخشەڕێگای شەڕێکی بێئامان، لە نێوان دنیای ڕۆژئاوا و جیهانی ئیسلامیدا دادەڕێژێت. هەر ئەمەشە دواتر دەبێتە زادەی فیکری و عەقائیدی، جەنگاوەرە خۆکوژەکانی (قاعیدە) و لە یازدەی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١ و دواتریش لە ٢٠٠٤ و ٢٠٠٥ لە مەدرید و لەندەنیشدا، بەچاکترین شێوە دەکەونە پراکتیزەکردن و کارپێکردنی بەشێوەیەکی عەمەلی.

با وەک نموونەیەک، چەند پەرەگرافێک لە نووسینێکی "سەید قوتب" وەرگرین کە لە بەرواری (١٩٥٢/١١/٣) لە ژمارە (١٠٠٩)ی ساڵی بیستەمی گۆواری (الرسالة)دا بڵاو کراوەتەوە و تێیدا دەڵێت: (خەون بە ئەوەیەکەوە دەبینم، زمانی هەموو ئەوانە لە گۆ بخەن کە لە قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگەکاندا، ستایشی پیاوی سپی دەکەن و بە باڵای ڕۆئاواییەکاندا دەخوێنن. بە تاسەی ئەوەیەکی تازە پێگەیشتووەوەم، بێت و هەموو ئەو قەڵەمانە بشکێنێت کە سەرشۆڕانە و بێشەرمانە ستایشی پیاوی سپی دەکەن. ئەو ڕۆژەی بەم شێوەیە کۆلۆنیالیزم لە ڕۆح و ئەقڵماندا تووڕ دەدەین، ئەو ڕۆژەی رقێکی پیرۆز لە خوێنماندا قوڵپ دەدات دژ بە هەر شتێ کە ئەورویی و ئەمەریکاییە و هەموو ئەو شتانە دەپسێنین کە بەرەوتی کۆلۆنیالیزممانەوە دەبەستیتەوە، ئەو کات دەتوانین بڵێین ئازادین و سەربەخۆیی تەواومان بەدەست هێناوە).

هاوکات لە شوێنێکی تردا دەنووسێت: (ئای چەند دڵ پڕ لە رق و کینەم لە ڕۆئاواییەکان. مەبەستم هەموویانە بەبێ جیاوازی، هەر لە ئینگلیزی و فرەنسی و هۆڵەندییەکانەوە تا دەکاتە ئەمەریکاییەکان).

"سەید قوتب" ئەمەریکاییەکان وەک بوونەوەرێکی گەلحۆ و شەهوانیی بێهەست و نەست و پارەپەرست و بێ دین و مۆراڵ تەماشا دەکات و وەک شارستانییەتێکی تاریک و مایەپووچ نیشانیان دەدات. لە نامەیەکیدا کە لە ئەمەریکاوە بۆ" تۆفیق ئەلحەکیم" نووسەری دیار و ناوداری ئەوسای میسری دەنێرێت، دەڵێت: (ئەم وڵاتە لێوان لێوە لە هەموو شتێک، تەنیا شتێ کە نییانە و بێ نرخ تەماشای دەکەن، مەسەلەی ڕۆح و ویژدانە).

لە دوای هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەر، لەسەر هۆکار و بەرهنجامەکانی ئەو کردەوە تیرۆریستییانە، لێرە و لەوێ باس و لێکۆڵینەوەی زۆر و زەوەند نووسراوە. یەکێک لەو نووسینانەی باس لە هۆکارەکانی ئەو

رووداوە دەكات، كتێبەكەی توێژەری فرەنسایی "گی سورمانە"ە بەناوی (نەوەكانی رەفاعە رافع تەهتاوی... نەوەكانی سەید قوتب).

"گی سورمان" لەو كتێبەیدا، حیكایەتی دوو سەفەرمان بۆ باس دەكات. یەكێكیان لە سەدەی نۆزدەیەمدایە و بۆ پاریسە و كەسێكی وەك "تەهتاوی " پێ هەڵدەستێ، ئەوی تریان لە ناوەڕاستی سەدەی بیستدایە و بۆ نیویۆركە كەسێكی وەك "سەید قوتب" ئەنجامی دەدات. هەردوو سەفەرەكە لە قاهیرەوەیە بۆ خۆرئاوا. هەردووكیشیان بۆ یەك مەبەستە، ئاشنابوون بە كولتووری شارستانی مۆدێرن و بەهرەمەندبوون لە دەسكەوتە تازەكانی جیهانی نوێ، بەڵام بەرەنجامی هەردوو سەفەرەكە وەك یەك نابن و دوو ئاكامی جیاوازیان لێ دەكەوێتەوە.

"تەهتاوی " وەك رۆشنگەرێك و وەك بوونەوەرێك كە تینووی زانین و مەعریفەیە، روودەكاتە ئەوروپا و بەتایبەتیش (پاریس). ئەوێ وەك سەرچاوەی زانست و مەعریفە دەبینێ و تا سەر ئێسقان سەرسامە بەوەی، رۆژئاوا لە رێی رێنسانس و رۆشنگەر و مۆدێرنەوە پێی گەیشتووە. واتە خوازیارە لە میسر و جیهانی ئیسلامیشدا هەمان ئەزموون دووبارە بێتەوە. هاوكات وڵاتەكەی زیاتر بەسەر ئەو شارستانییە دەوڵەمەندەدا بكرێتەوە و سوود لە توانا فیكر و مادی و تەكنۆلۆجییەكانی رۆژئاوا وەرگرێت واتە ئەوەی "تەهتاوی " لەمیانەی ئەو سەفەرەیدا چنگی لێ گیر دەبێت، سەرسامبوونە بەدەستكەوتەكانی جیهانی مۆدێرن لە رۆژئاوا. كرانەوەیە بەسەر شتگەلێكی دنیای تازەدا كە هەمووی بەدەستكەوتی مرۆڤایەتی دەزانێت و دڵخۆشە پێیان، نەك ئیرەیییان پێ بەرێت و لە هەوڵی كەمكردنەوە و بەسووك سەیركردنی ئەو دەسكەوت و بەرەو پێشچوونانەدا بێت. بە كورتییەكەی ئەو (پاریس) وەك نموونەیەكی بچووككراوەی شارستانییەتی مۆدێرنی رۆژئاوا دەبینێت، بە بەهەشتێك و بە ئەوجی تەمەدون و سەرزەمینی هاتنەدی

خـــەونەکـــانی مـــرۆڤ ســــەیر دەکـــات. بۆیـە خـــوازیارە هـاودین و هاونیشتمانییەکانی لە میسر و وڵاتەکانی تری رۆژهەڵات، بتوانن لە رێی زانست و مەعریفەوە بەهەمان ترۆقی پێشکەوتن بگەن و لە مەدەنییەت دوا نەکەون.

بەڵام سەفەرەکەی "سەید قوتب"، بەرەنجامی پێچەوانەی ئەوەی "تەهتاوی " لێ دەکەوێتەوەو "سەید" دیدگای جیاواتری لەسەر ئەمەریکا و رۆژئاوا دەبێت ئەو نەک هەر سەرسام نابێت بەو جیهانە تازەیە و بەو قەڵەمبازی پێشکەوتنەی ئەمەریکا داویەتی لە بواری زانست و زانین و تەکنەلۆجیادا، بگرە ئەوانە بە جاهلیەتێکی تازە ناوزەد دەکات و ئەمەریکا و شارستانییەتە نوێیەکەشی، وەک هەرێمی کوفر و گومڕایی و سەرلێشێوان سەیر دەکات.

نیویۆرک بۆ ئەو نەک هەر بەهەشت نییە، بگرە دۆزەخێکی راستەقینەیە کە مرۆڤە بەدبەختەکان تیایدا وزە و توانای خۆیان لە کارگە و فابریقە زبەلاحەکاندا هەراج دەکەن. بەناوی ژیانکردن و خۆشگوزەرانیشەوە، ئەتکی زیندەگی و ژیانی خۆیان دەکەن. بۆ ئەو نیویۆرک و شارستانییەتی ئەمەریکی شوێنێک نییە، تا مرۆڤ مومارەسەی مرۆڤبوونی خۆیی تێدا بکات و بەهرەکانی خۆی تێدا تاقی بکاتەوە و لەزەتی ژیان بکات، بگرە مەملەکەتێکە بۆ مەسخبوونی کەینوونەی ئیسنان و کوشتنی ئیرادە و بەهرە و ژیاندۆستی.

ئەم رقە زۆرەیە "سەید قوتب" دەخاتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی دەبێت، هەرچی لە توانامانـدایە بیخەینە گەڕ بۆ دژایەتیکردنی ئەو مۆدیلە ژیارییە و بەرپەرچدانەوەی بەهەر رێگایەک بووە. ئەوە ئەوە بەدەنگی بەرز دەڵێت: (با هەر لە منداڵییەوە جگەرگۆشەکانمان بەوە ڕابێنین کە پیاوی سپی دوژمنی مرۆڤایەتییە و پێویستە لە هەلێک بگەڕێین بۆ تۆڵەسەندنەوە لەو بوونەوەرە).

ئەو میراتییە فیکرییەی "تەهتاوی " جێی هێشت لەسەر جیهانی خۆرئاوا،

کەسانی وەک "قاسم ئەمین" و "تەها حسێن" و "ئەدۆنیس" و " تەرابیشی "و "عەفیف ئەخزەر" و "نەسر حامد ئەبو زێد"ی بەدوای خۆیدا هێنا و ئەمانە بوونە نەوەی "تەهتاوی " و نوێنەری خەڵکانی لیبراڵ و کراوەی ناوجیهانی ئیسلامی. لەو لاشەوە ئەو میراتییە ئایدۆلۆجییەی "سەید قوتب" لە دوای خۆی جێی هێشت، نەوەیەکی توندڕۆ و دەمارگیر و خەڵکی شەڕانگێزی دروست کرد کە "محەمەد عەبدولسلام فەرەج" و "خالد ئیسلامبولی "و "عەتایل" و "رەمزی بن شیبە" و "محەمەد عەتا" و "مەروان شیحە" و خالد شیخ محەمەد"، دیارترین نموونەکانین.

بەداخەوە دواجار ئەوەی لە وڵاتانی ئیسلامیدا زاڵ بوو، دەنگ و سەدای نەوەکانی "سەید قوتب"بوو، نەک دەنگ و رەنگی نەوەکانی "تەهتاوی ". لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران و لەشکرکێشیی سوپای سووری سۆڤیەتی بۆ سەر ئەفغانستان، رۆژ بەرۆژ دەنگی نەوەکانی "سەید قوتب" زوڵاڵتر دەبێت و دەنگی نەوەکانی "رەفاعە رافع تەهتاوی "یش کزو خەفەتر دەبێت. هەر بۆیە ئێستا بە سەردەمی زێڕینی ئسوولییەکان ناودەبرێت، نەک سەردەمی دەنگە لیبڕال و رۆشنگەرەکان.

## پاپا لانگی لە نێوان "تویباڤی" و "سەید قوتب"دا

شارستانییەتی ڕۆئاوا، هەربەتەنیا جێ رەخنەی ئیسلامییە ئسوولییەکان نەبووە. بەتەنیا ئەوان گلەییان لە کەموکوڕییەکانی دنیای مۆدێرن نەبووە و رووە تاریک و نێگەتیڤەکەیان نیشان نەداوە. ئەم پرۆسەی رەخنەگرتن هەمەلایەنە و تەنانەت لە هەناوی ڕۆئاواشیدا، زیاد لە قوتابخانەیەکی فیکری و هونەری و رۆشنبیری هەیە کە بە نەفەسێکی رەخنەگرانەی زۆر توند لەگەڵ ئەو شارستانییە تازەیەدا دەستەو یەخەیە. هەروەک نموونەیەک بڕوانە: (قوتابخانەی فرانکۆرت و پۆست مۆدێرنەکان و.. هتد).

یەکێک لەو دیکۆمێنتە زۆر تایبەت و قەشەنگانەی بەشێوەیەکی ورد و

سـەرنجـڕاکـێش، رەخنە لە ڕۆژئاواییـیـەکـان دەگـرێت و رووبەرە تاریک و درێژەکـانی ئەو هـەرێمـە نیـشـان دەدات، دەقـێکی دانسـقـەی "تویـیـاڤی " سـەرۆکی خـێـڵـەکـانی دەریای باشـووورە کـە را و سـەرنجی لەسـەر ئەوروپاییـەکـان، بۆ خـەڵک و خـوای هۆزەکـەی لە (ئوپولو) کـە دوورگـەیەکی بچکۆلانەی لاتەریکە و دەکەوێتە ناو کۆ دوورگەی (سـامـوا)، بەیان دەکات. (خوێنەری بەڕێز تەواوی وتەکانی تویباڤی لە دووتوێی کتێبێکدا چاپ کراوە بەناوی - پاپالانگی واتە پیاوە سپییەکە و ساڵی ۲۰۰۱ کاک خەبات عارف لە سویدییەوە کردوویەتی بەکوردی).

راسـتـە "تویـیـاڤی " رەخنەی توند ئاڕاسـتـەی رێـتـمـی ژیان دەکـات، لەناو شـارسـتـانیـیـەتی ئەوروپایـیـداو وەک هەڵەیەکی گـەورەو وەک کـۆلانێکی دەرنەچوو، دەڕوانێتە هـەمـوو پێشکەوتنێکی کولتووری ئەوروپاییەکان، بەڵام دەیەوێت ئەوە نیشان بدات کە هەوڵی ئەم لەو پێناوەدا و بۆ ئاگادارکردنەوەی براکانی لە خـۆشـەویستی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت، نەک لە رقەوە. ئەو دەیەوێت هاوولاتیانی خۆی ئاگاداربکاتەوە و بیانخاتەوە سەر ئەو بڕوایەی خـۆیان لە نـەفـرەتی پاپالانگی پیـاوە سـپـیـیـەکـە رزگـار بکەن. ئەوەشـیـان بەدەنگێکی پڕ لە خـەم و حەسرەتەوە پێ ڕادەگەیەنێت، بەڵام هەرگیز هانیان نادات بۆ رق لێبوونەوە و تۆڵەسەندنەوە. ئەوەتا دەڵێت: (کولتووری ئەوروپایی بووەتە مـایەی سـەرلێشـێوان و نارەسـەنکردن و ناسـروشـتیکردنی مـرۆڤ)، بەڵام مـافی ئەوە بەخـۆی نادات و پرکـێـشی ئەوەش نـاکـات بڵـێت: (تکایە منداڵەکانتان وا پەروەردە کەن تا رقیان لە پاپالانگی بێت و هەر کە گەورەش بوون، بیر لە تۆڵـەسـەندنەوە لە پیاوی سپی بکەنەوە). بەپێچەوانەی ئەمەوە "سـەید قوتب" لەگەڵ رەخنەی زۆری لە ئەمەریکا و شـارسـتـانیـەتی نوێ (کە بەسـەردەمی جـاهیلییـەت ناونووسیـان دەکـات)، تەئکید لە رق لێـبوونەوە و تۆڵەسـەندنەوە لە پاپالانگی (واتە پیـاوی سـپی) دەکاتەوە و نەخشـە رێگا بۆ ئەم کارە دادەنێت و ئاواتە خوازە نەوەیەک لە جیـهانی ئیسلامیدا پێ بگات،

ئەو تیۆریایانەی ئەو ببـاتە بواری پـراکـتـیک و ئەو خـەونانەی ئەو بکات بە واقیع. مـەترسی گەورەی تیژە و تیۆرەکانی "سـەید قـوتب" یش لێرەدایە کە دەتوانن لە هەرکاتێکدا بێت دەرگا بەڕووی دۆزەخدا بکەنەوە.

## (قاعیدە) و ولاَتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

وەکی لە سـەرەتاوە ئاماژەم پێ دا، ئەو چاوەی (قـاعیـدە) سەیری ئەمـەریکا و ڕۆژئاوای پێ دەکـات، کـتـومـت بەو چاوە دەچێت کـە "سـەیـد قـوتب" ڕۆژئاوا و ئەمـەریکای پێی دەبینێت، نەبینینی ئـەم نزیکایەتییە زۆر هـەقیقـەتمان لێ ون دەکـات، بەتـایبـەت لەوەی پێـوەندی بەدوژمنـایەتی زۆری جـەنگاوەرەکـانی (قـاعیدە)وە هـەیە، بەئەمـەریکا و ڕۆژئاواوە. (قـاعیـدە)ش وەک "سـەید قـوتب" پێیـان وایە ولاَتەیەکگرتووەکـانی ئەمـەریکا، سـەرزەمیـنی کوفر و مـەڵبـەندی شـەڕانگێـزی و سـەری مـارەکـەیە، بۆیە دەبێـت بەتوندترین شـێـوە دژایەتی بکرێت و لەناو ببرێت.

(قـاعیـدە) لەگـەڵ یەکـەمین بەیاننـامـەی خـۆ ئیـعـلانکردنیـدا لە شـوباتی ١٩٩٨دا، بەپێـتی درشت دەنووسن: (کــوشــتنی ئەمــەریکاییــیــەکــان و هاوپەیمانەکانیان ئەگەر مەدەنی بن یان سەربازی، واجبی سەرشانی هەموو موسـڵمـانێکە کە توانـای ئەنجـامـدانـی ئەو کـارەی هەبێت). لەلایەکی ترەوە "ئەیمـەن زەواهـیــری " ســـەرکـــردەی تـازەی ڕێکخـــراوی (قـــاعـــیـــدە) لە نامـیلکـەیەکـیـدا بەناوی (فـرسـان تحت رایة النبي) دەڵێت: (مـوسـڵـمـانانی جیـهان رابن و خۆتان سازدەن، بۆ جیهاد لە دژی خاچپـەرستە نوێیەکان کە ئەمەریکاییەکانن).

گیروگـازی ڕێکخراوی (قاعیدە) و هـاوشـێوەکانی لە کۆتاییـیەکانی سـەدەی رابردووەوە تـا ئـەمـڕۆ، نیشـانـدەری ئەو راسـتـیـیـەن کـە چ رقێکی ئاشکرا و پەنهـان لە ژی ئەمـەریکاییـیەکـان و شـارسـتـانییـەتـی ڕۆژئاوا لە کـاردایە. ئەم رقـەش بووەتە بـەشـێک لە سـایکۆلۆجـیـەتـی کـارەکـتـەری جـەنـگاوەرەکـانی

(قاعیده) و تێکڕایی ئەو گرووپە ئسووڵییە توندڕۆیانەی وەک (قاعیدة) بیر دەکەنەوە. ئەم ڕقە بووەتە بەشێک لە سیستەمی بیرکردنەوە و دنیابینیی زۆرێکی زۆر لە ئیسلامیستەکان و بەشێک لە سایکۆلۆجیەتیان پێک دەهێنێت.

ئەوەی لە نیو سەدەی ڕابردوودا دەبوو بە ڕۆحی تۆڵە ئەستێنێ مامەڵەی لەگەڵ ئەمەریکادا بکردایە، یابانییەکان بوون کە لە کۆتایی دووەم جەنگی جیهانیدا (هیرۆشیما) و (ناکازاکی) بوونە قوربانی بۆمبە ئەتۆمییەکانی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا. یان دەبوو ئەفریقاییەکان خۆیان بەسەر شارەکانی واشنتۆن و نیویۆرکەوە بتەقاندایەتەوە، وەک تۆڵەسەندنەوەی هەژار و بەشمەینەتەکانی ئەو کیشوەرە، لەو دنیایەی مرۆڤەکانی تا ئاستی ئینتەلاکردن لەبەرخۆریکردناندا غەرق بوون، بەلام هیچ یەک لەمانە ئاستی مەرگ دۆستی و ڕۆحی شەڕانگێزییان، ناگاتە ئاستی ئەو کارەکتەرانەی (قاعیدە) کە وەک تاکە نوێنەری خوا لەسەر زەوی ڕەفتار دەکەن و ژیان بەخشین و ژیان لێسەندنەوە لە مرۆڤەکان، بە مافی بێ غەلوغەشی خۆیان دەزانن.

دەبێت دڵنیابین لەوەی کە تیرۆر و کوشتن، سەرەتا و بەر لە هەر شتێ بەفیکر دەست پێ دەکات. ئەو فیکرو ئایدۆلۆجیایەی تیۆریزە بۆ توندوتیژی دەکات و ڕەوایەتی بەسڕینەوە و کوشتنی ئەوی دی دەدات، ڕێ خۆشکەرە بۆ سەرهەڵدانی جەنگاوەرگەلێکی وەک ئەوانەی (قاعیدە) کە یازدەی سێپتەمبەریان خوڵقاند. وەک ئەوانەی لە عێراقی سەردەمی "زەرقاوی "دا، مرۆڤیان گۆشاوگۆش سەر دەبڕی. بۆ بەرگرتن بەتوندوتیژی و کاری تیرۆریستی، هەر بەتەنیا تەقاندنەوەی ئەشکەوتەکانی قەندەهار و دەستگیرکردنی "ڕەمزی بن شیبە" و تیرۆرکردنی "بن لادن" و "زەرقاوی " بەس نییە، بگرە پێش هەموو شتێ پێویستە ئەو سەرچاوە فیکری و

ئایدۆلۆجـیـیـانە وشک بکرێت کـە دەبنە زادی رۆحی هـەمـوو ئەوانـەی بە ویژدانێکی ئاسوودەوە خۆیان دەتەقێننەوە.



# "تاریق عەلی" و هەجوکردنی ئەمەریکا

"من دوژمنی سەرسەختی ئیمپریالیزمی ئەمەریکییم"

-تاریق عەلی-

## قەڵەمی ڕەخنەگرێکی دۆنکیشۆتی

لە دوای کەوتنی دیواری بەرلین و لە بەریەک هەڵوەشانی بلۆکی ڕۆژهەڵات، ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا لەلایەن دوو هێزەوە زۆر بەتوندی دژایەتی دەکرێت و پەلامار دەدرێت، هێزێکیان ئیسلامییە پەرگیرەکانی وەک تالیبان و قاعیدەن، ئەوی تریشیان چەپێکی تەقلیدییە کە کەسانی وەک "تاریق عەلی" ڕێبەرایەتییان دەکەن.

"تاریق عەلی" نووسەر و ئەکتیڤیست و سینەماکارە.. سەرنووسەری کۆواری (نیولیفت رڤیو واتە چەپی نوێ)یە. لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٣، بەڕەچەڵەک پاکستانییە و ڕەگەزنامەی بەریتانی هەیە.. وەک چەپێکی رادیکاڵ و وەک ترۆتسکییەکی ئانارشیست، بۆ نیو سەدە دەچێت خەریکی دژایەتیکردنی سیستەمی سەرمایەداری و جەبەرووتی ئەمەریکییە. وەک دەنگێکی ناڕازی و وەک مارکسیستێکی ڕەخنەگر، لە گەرمەی شەڕی ڤێتنامدا دەرکەوت. ساڵی ١٩٦٥ کە بووە سەرۆکی خوێندکارانی زانکۆی ئۆکسفۆرد و لەسەر جەنگی ڤیتنام مونازەرەیەکی لەگەڵ "هێنری کیسنجەر"دا ساز دا، بەخێرایی ناسرا و نێوبانگی پەیدا کرد.

لەو مێژووەوە تا ئەمڕۆ، کاری ئەو بووە بە هەجوکردن و دژایەتیکردن و ڕەخنەگرتن لە ئیمپراتۆریای ئەمەریکی و کۆی سیستەمی سەرمایەداری. (من یەکبینە خەریکی ڕەخنەگرتن و دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم و هەڵسوکەوتەکانیم). ئەمە قسەی "تاریق عەلی " خۆیەتی.

ئەو کەفوکوڵەی کە لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا شەڕی سەرمایەداری پێ دەکرد، لە ئێستاشدا هەر درێژەی هەیە و بگرە توندتریش

بووە. لە دوای کارەساتی یازدەی سێپتەمبەریشەوە، ئەم پیاوە یەکبینەو بێ گوێدانە ئەوانەی دژایەتی ئەمەریکا دەکەن، کێن و چین و چۆن بیر دەکەنەوە، لە هەوڵی دنەدانی زیاتری ئەو هێز و نەیارانەی ئەمەریکادایە و ئەم قۆناغە تازەیەش، وەک سەرەتای کۆتایی سیستەمی سەرمایەداری و ئیمپراتۆریای ئەمەریکی ناوزەد دەکات.

فەیلەسووفی لیبرالیی هاوچەرخی فەرەنسی "فرانسوا رۆفێل"ی خاوەنی کتێبی (مارکس و مەسیح)، لە شوێنێکدا باس لەوە دەکات کە (تەواوی ئینتلجنسیای فەرەنسی و ئەورووپی لە بەرانبەر ئەمەریکادا، دوچاری پەتای بەدگومانی هاتوون و ئەم پەتایەش لەو کاتەوە تووش بوون کە خانەکانی مێشکی ئەو ئینتلجنسیایە، ڤایرۆسی ئایدۆلۆجیای مارکسیزم لێی دا).

ئەڵبەت زۆرێک لەوانە لەگەڵ شکستی ئایدۆلۆجیای مارکسیزم و لەبەریەک هەڵوەشانی بلۆکی سۆسیالستیدا، را و بۆچوونی خۆیان گۆڕی و دەستبەرداری ئەو قەناعەتانەی پێشوویان بوون و بەجۆرێکی تر کەوتنە تێفکرین لە دنیا، بەڵام هەندێکی تر وەک ئەوەی هیچ نەگۆڕابێت لەسەر هەمان ڕیتمی جاران بەردەوام بوون. "تاریق عەلی" و سەمیر ئەمین" و "مەحموود ئەمین عالم"و.. هتد، چەند نموونەیەکن لەوانە.

ئەمانە تائێستاش ئەو گوتارە کۆن و بەسەرچووە دووبارە دەکەنەوە کە دەڵێت: (دەبێت سەرمایەداری لە گۆڕ بنرێت، چونکە تاوانێکی گەردوونییە و گەر گۆڕ نەکرێت، ئەوا بەحەتمی گەردوون و مرۆڤایەتی بەرەو فەنابوون دەبات). بەو پێیەشی سەرمایەداری وەک سیستەمێکی چاوچنۆک و مۆنۆپۆڵخواز، چارەنووسی مرۆڤایەتی بەرەو ماڵوێرانی و لەناوچوون دەبات، ئەوا دەبێت قوتار بوون لە دەست ئەو بەڵا گەورەیە، ببێتە پێداویستییەکی هەنووکەیی چارەنووسساز.

ئەمانە ڕێک و ڕاست وەک سەردەمی "مارکس" و نووسینی (کەپیتاڵ)،

ناکۆکییەکانی نێو هەناوی سیستەمی سەرمایەداری وەک بەڵگەیەکی زیندووی حەتمییەتی مەرگی سەرمایەداری تەماشا دەکەن. لە کاتێکدا مێژوو بەئەزموون سەلماندی کە ئەوە بۆچوونێکی نادروستە و لەجێی خۆیدا نییە، چونکە ئەو ناکۆکییانە نەک ئێماژەی مردن و لەناوچوونی سیستەمی سەرمایەداری نین، بگرە بەڵگەی تەواوی زیندوویەتی هەمیشەیی سەرمایەدارییە.

یەکێک لە ئیشکالییەتە گەورەکانی ئەم چەپە تەقلیدیە ئەوەیە کە دەیەوێت لەنێو جیهانێکی گۆڕاو و تازەدا، بە هەمان نەفەسی جاران و بە هەمان کەرەستە و گوتاری پێشوو، درێژە بە شەڕ و ململانێکانی خۆی بدات، وەکی ئەوەی هیچ رووی نەدابێت. ئەمەش بۆ خۆی دۆخێک دەخوڵقێنێ، هەم تراژیدی و هەم کۆمیدی.

چەند ساڵێک دوای کەوتنی دیواری بەرلین و دەرکەوتنی سەرەتاکانی گلۆبالیزمیشن، "سەمیر ئەمین" بە زمانی فەرەنسی کتێبێکی بڵاو کردەوە بەناوی (تحديات العولة). خاوەنی تیۆریای (گەشەی ناهاوسەنگ) لەو کتێبەیدا، وەک جاری جاران و بەهەمان هەناسەی شەست و حەفتاکانی سەدەی رابردووەوە، کەوتبووە پەلاماردانی سیستەمی سەرمایەداری و رەخنە ئاژنکردنی ئەمەریکا و هاوشێوەکانی. لە پای بۆچوونەکانی ناو ئەو کتێبەشدا، "جۆرج تەرابیشی " لە رۆژنامەی "الحیاة "ی لەندەنیدا و بەنووسینێکی کورت کەوتە وەڵامدانەوەی. "تەرابیشی " لەو نووسینەیدا، "سەمیر ئەمین" بەو سەربازە جاپۆنییانەی دوای جەنگی جیهانی دووەم دەچوێنێ کە بۆ ماوەی سالانێک بێئاگاداری لەناو جەنگەڵەکاندا مانەوە، لەو قەناعەتەوە کە جەنگی گەورە هەر بەردەوامە و درێژەی هەیە.

واتە "سەمیر ئەمین" بەو جەنگاوەرانە دەچێت دوای کۆتاییهاتنی شەڕ و ئاگربەستیش، گۆڕەپانەکە چۆڵ ناکات و ئامادە نییە چەکەکەی لە شان

دابگرێت. ئەڵبەت چەکی دەستی ئەویش مارکسیزمە و جەنگی نەبڕاوەشی لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداریدایە. "تاریق عەلی "یش نموونەیەکی تری ئەم حاڵەتەیە. ئەم پیاوەش بەگوتارێکی چەند بارە و بەکلێشەیەکی دێرینی سەردەمی "مارکس"ەوە، دەیەوێت بەگژ کەپیتالیزم و ئیمپراتۆریای ئەمەریکیدا بچێتەوە. بۆ ئەم گۆڕانی هەلومەرجی دنیا گرینگ نییە، ئەو شوێن حەتمییەتێکی مێژوویی کەوتووە کە درەنگ یان زوو دەبێت بێتە دی و پێی بگات، ئەو حەتمییەتە مێژووییەش مەرگی یەکجاریی سەرمایەدارییە.

"تاریق عەلی" و نموونەکانی لەوانەن کە هیچ لە مێژووەوە فێرنابن و ئەزموونەکانی مێژوو هیچیان پێ ناڵێت. ئەمانە تا هەنووکەش سوورن لەسەر ئەوەی کە دەبێت، بەر بە سەرمایەداری بگیرێت و وەڵام بە پرۆژەی سەرمایەداری بدرێتەوە. لە کاتێکدا سەدەی بیستەم لێوان لێوە لە پرۆژەی شکست خواردوو بۆ وەڵامدانەوە بەپرۆژە و سیستەمی سەرمایەداری. نموونەکانیان وەک: (بەلشەفییەکان و ماوییەکان و کاسترۆییەکان و ئیرۆکۆمۆنیزم و سۆسیالیزمی دیموکراسی و سۆسیالیزمی نەتەوەیی). هاوکات هەموو ئەو هەوڵانەشی تا ئێستا دراون بۆ دەربازبوون و بەرگرتن بەڕەوتی سەرمایەداری، هەموویان بەرەو بەربەرییەت چوون، بڕوانە: (بەربەرییەتی نازیزم و فاشیزم و ستالینزم و لە ئێستاشدا ئیسلامیزم).

"تاریق عەلی " یەکێکە لەوانەی لە دوای یازدەی سێپتەمبەرەوە، هەجوکردنی ئەمەریکا و دژایەتیکردنی سەرمایەداری کەیاندووەتە ترۆپک و لەم پێناوەشدا، کۆی لەوە نەکردووەتەوە کە بۆ خاتری شکستهێنان بە بەربەرییەتی سەرمایەداری و ئیمپراتۆریای ئەمەریکی، بداتە پاڵ بەربەرییەکانی تری وەک "هۆکۆ چاڤێز" و "کاسترۆ" و "مۆرالیس"و فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی و مقاوەمەی عێراقی.

تایتڵی ئیشکردنی "تاریق عەلی " لەم دە ساڵەی رابردوودا، ئەوە بووە

(لەپێناو زەبر وەشـاندن لە ئـەمـەریکا، پەنا بردن بۆ ئەهریمەنیش کـارێکی ڕەوایە). ئەم ئەکتیڤیسـتـە مارکسییەی وەکی خۆی دەڵێت: (کاریگەری زۆری ئیدوارد سـەعید و ئیعجاز ئەحمەد و تێری ئیگڵتۆنی لەسەرە)، بەڵام یەکێکە لەو نووسـەرە رووکـەشـانەی لە تەواوی گـوتار و نووسـینەکـانیـدا لـە هـەوڵی تەبسـیـتکردنـەوەی ژیان و ئاسـانکردنەوەی کـێشـەکـاندایە، ئەویش لە ڕێی دابەشکـردنـی دنیـا بۆ دوالیـزمـەی (چاک/خـراپ)، (پاک/ چەپەڵ)، (ئیمپراتۆریا/ بەرخودان)، (سەرمایەداری / سوسیالیزم).

لێرەوەیە ئەو بزووتنەوەیەشی کە ئەم ڕابەرایەتی دەکات و خۆی بەنوێنەری دەزانێت، بزووتنەوەیەکـە لەسـەر بنەمـای نەفـیکردنی تـوانست و پێـویسـتی شـیکردنەوە و شـرۆڤـەکاری واقـیع کـار دەکـات. واتە بزووتنەوەکـەشی وەک خۆی کتومت، کوشـتەی تەبسـیتکردن و ئاسانکردنـەوەی کێشـەکانە و ئەوەی عەودالیەتی و بەدوایدا دەگەڕێت، چارەسەری خێرا و حازر بەدەستە بۆ کۆی قەیرانەکانی دنیای ئەمڕۆ، بەبێ هیچ خوێندنەوە و شرۆڤەکارییەک.

بەم پێیە "تاریق عـەلی "و بزووتنەوە تەقلیدییەکەی، تـەواو قەناعـەتیـان بەو وتەیەی "مـارکس" هـەیە کـە دەڵێت: (تا ئێـسـتـا بیـریاران و فـەیلەسـووفـان سـەرقاڵی تەفسیرکردنی دنیا بوون، لێرە بەدواوە کاتی گۆڕینی هاتووە).

"تاریق عەلی " بێ پەروا جەخت لە گۆڕینی دنیا دەکاتەوە.. ئەگەر تا دوێنێ گرینگ بووبێت بزانێت ئەو کارەکتەرانە کێن کە ئەو پرۆسەیە ئەنجام دەدەن، ئەوا لـەمـڕۆدا و دوای سـەدەیەک نائومـێـدی لە بردنـەوەی گـرەوەکـە لە سەرمایەداری، گرینگ نییە لەگەڵ کێ و بە چ شـێوازێک ئەو شـەڕە دەکرێت. ئەگەرنا (فـەلووجـە و کـاراکاسـی)، وەک دوو مـەڵبـەندی ئومـێد و بـەرخـودانی سیستەمی سەرمایەداری و ئیمپراتۆریای ئەمەریکی نەدەبینی.

ڕەخنەگرتن لە سیستەمی سـەرمایەداری و لەوەی پێی دەڵێن ئیمپریالیزمی ئەمـەریکی و ناوەندچێـتی ڕۆژئاوا، تا ئەو پەڕی پێـویسـتـە و کـارێکە لە جـێی

خۆیدایە، بەڵام بە چاوێکی واقیعی و بە نەفەسێکی شیلگیرانە، نەک بە مەزەندەی چەپێکی هەرزەکار و قەڵەمی رەخنەگرێکی دۆنکیشیۆتی.

## "تاریق عەلی" و هەجوکردنی ئەمەریکا

"تاریق عەلی" یەکێکە لەو چەپانەی زۆر دەنووسن و زۆر دەڵێن و زۆر دەردەکەون. ئەم کارەکتەرە وەکی لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێ دا هەمەکارە، (نووسەر، ئەکتیڤیست، سینەماکار، شانۆکارە و دەست بۆ نووسینی مێژووش دەبات.. هتد).

لە دوای یازدەی سێپتەمبەریشەوە، وەک سەردەمی گەنجێتی لە گەرمەی شەڕی ڤێتنامدا، بەگوڕ و تینێکی ترەوە هاتووەتەوە مەیدان و بەچالاکی جۆراوجۆر دژایەتی خۆی، بۆ ئەمەریکا و سیستەمی سەرمایەداری دووپات دەکاتەوە.

لە دوای هێرش و پەلامارەکانی سەر نیویۆرک و واشنتۆنەوە، چەندین کتێب و دەیان وتار و گفتوگۆی ئەنجامداوە کە زۆربەیان دووبارەن و هەندێ ئایدیا و بۆچوون هەیە، بەچەندین تەعبیر و شێوازی جیاجیا دەیانبینین. لێرەدا ئێمە نموونە بە دوو کتێبی دێنینەوە، یەکێکیان نووسینە و ئەوی تریان کۆ دیدارە. کۆ دیدارەکە "دایڤید بارسامیان" سازی داوە و بەناوی (ئیمپراتۆریا و بەرخوادنەوە)یەو لەنێو سالآنی ٢٠٠١ بۆ ٢٠٠٥ ئەنجامدراوە و تایبەتە بەقسەکردن لەسەر (ئیمپراتۆریای ئەمەریکی و بەریتانی، مێژووی پاکستان و هندستان، مقاومەمە لە فەلەستین و عێراق و ئەمەریکای لاتین، سەرهەڵدانی فێندەمێنتالیزمی ئاینی، گەڕان بەدوای سۆسیالیزمێکی دیموکراسی ئەلتەرناتیڤدا).

چاپی یەکەمی ئەم کتێبە ساڵی ٢٠٠٦ لە بەیروت و لەلایەن (دار الآداب)ەوە بلآو کراوەتەوە و "سەماح ئیدریس" بەئەرکی وەرگێڕانەکەی

هەستاوە. ئەو کتێبەی کەیان کە لە نووسینی خۆیەتی، ئەمە ناونیشانەکەیەتی (بوش لە بابل سەرلەنوێ کۆلۆنیالیزمکردنەوەی عێراق)، ساڵی ٢٠٠٤ لە بەیروت و لەلایەن (دار سطور) چاپ کراوە و خاتوو "فاتمە نەسر" کردوویەتی بەعەرەبی.

لێرەدا دەبوو ئاماژە بە کتێبێکی تری "تاریق عەلی "ش بکەم بەناوی (پێکدادانی فێندەمێنتالیستەکان)، چونکە ئەوەش کتێبێکە لە دوای رووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر نووسراوە و هەڵگری هەمان ئەو دنیا بینییانەیە کە لەو دوو کتێبەی تردا هەن، بەڵام لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەکە، واز لەوە دێنین و ئیکتیفا بە و دوو سەرچاوەی تر دەکەین.

لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم، بەکورتی چەند نموونەیەک لە بۆچوونەکانی "تاریق عەلی " لەو دوو کتێبەدا نیشان بدەم.

## "بوش" لە بابل

ئەم کتێبە بەرهەمی پرۆسەی ئازادی عێراقە.. "تاریق عەلی" لەلایەک بۆ هەجوکردن و داشۆرین و ئابڕووبردنی ئەمەریکا نووسیویەتی، لەلایەکی تریش بۆ ئەوەی بە ئەمریکا و دنیاش بڵێت کە ئەم سەرکەوتنەیان لە عێراق زۆر ناخایەنێت و پرۆسەکەیان بە شکست کۆتایی دێت.

ناوەڕۆکی کتێبەکە تایبەتە بەمێژووی نوێی عێراق، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەوە تا بەراییەکانی سەدەی بیست و یەک. واتە باس لە ماوەی نێوان هەرەسی خەلافەتی عوسمانی دەکات لە دوای یەکەم جەنگی جیهانییەوە، تا رووخانی بەعس و رژێمەکەی "سەدام حسێن" لە نیسانی ٢٠٠٣دا.

لە راستیدا ئەوەی "تاریق عەلی " دەیکات لەم کتێبەدا نووسینەوەی مێژوو نییە، ئەوەندەی هەڵپڕووکاندنی مێژووە. دەست بردنە بۆ قۆناغێکی مێژوویی دەوڵەتی عێراقی، لەپێناو مەرامێکی تایبەتیدا. مرۆڤ سەرەوەختێک مێژووی

نوێی عێراق له ڕێی قه‌ڵه‌می که‌سانی وه‌ک: "مه‌جید خه‌دووری و حه‌نا به‌تاتۆ و عه‌بدولره‌زاق حه‌سه‌نی و عه‌لی وه‌ردی و حه‌سه‌ن عه‌له‌وی "یه‌وه ده‌خوێنێته‌وه و ئه‌و مێژووه‌ش ده‌بینێ که "تاریق عه‌لی " به‌و شێوه سه‌تحی و سه‌رپێیه باسی ده‌کات، تووشی واق وڕمان ده‌بێت و هه‌ناسه‌ی سوار ده‌بێت.

ئه‌وه‌ی بۆ "تاریق عه‌لی " گرینگه له به‌سه‌رکردنه‌وه‌ی ئه‌و ماوه مێژووییه‌ی عێراقدا، ته‌نیا یه‌ک شته‌، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه نیشانی بدات وه‌ک چۆن به‌ریتانییه‌کان، دوای کۆلۆنیالیزمکردن و مانه‌وه‌ی چل و یه‌ک ساڵی ره‌به‌ق له عێراقدا (١٩١٧ بۆ ١٩٥٨) هیچیان ده‌سگیر نه‌بوو، دواجار به‌ده‌ست به‌تاڵی گه‌ڕانه‌وه، ئه‌مه‌ریکاییه‌کانیش هه‌مان چاره‌نووس چاوه‌ڕێیان ده‌کات و وه‌ک به‌ریتانییه‌کان به به‌زیوی عێراق جێ دێڵن. وه‌ک خۆی ده‌ڵێت: (من له کتێبی بوش له بابلدا، باس له‌وه ده‌که‌م که بۆچی به‌ریتانییه‌کان دوای ئه‌و هه‌موو ساڵه شکستیان خوارد و نه‌یانتوانی بمێننه‌وه. بێگومان ئه‌مریکییه‌کانیش له ئێستادا هه‌مان مێژوو دووباره ده‌که‌نه‌وه و سه‌رئه‌نجام وه‌ک به‌ریتانییه‌کان، به‌ده‌ست به‌تاڵی ده‌چنه ده‌ره‌وه).

داخ له دڵیی "تاریق عه‌لی " له ئه‌مه‌ریکا و له‌"بوش" و ده‌ستوپێوه‌نده‌کانی، ده‌یگه‌یه‌ننه ئه‌وه‌ی مقاوه‌مه‌ی عێراقی له کۆنه به‌عسییه‌کان و پاشماوه‌ی قاعیده و که‌سانی وه‌ک "حارس ئه‌لزاری " و "ئه‌بو ئه‌یوبی به‌غداد"ی و "ئه‌بو موسعه‌بی زه‌رقاوی "، به (MAQUIS) ناو به‌رێت. واته موقاوه‌مه‌ی عێراقی به‌و جه‌نگاوه‌رانه‌ی فره‌نسا ده‌چوێنێت که له چله‌کاندا و له پاریس، به‌گژ نازیزمه داگیرکه‌ره‌کانی ئه‌ڵمانیادا ده‌چوونه‌وه. له به‌شێکی تری کتێبه‌که‌یدا ده‌ڵێت: (موقاوه‌مه‌ی عێراقی له‌و جۆره مقاوه‌مانه‌یه که جاران له جه‌زائیر و ڤێتنامدا هه‌بوو). له‌لایه‌کی تره‌وه مۆجیاری کورد و شیعه ده‌کات و ده‌ڵێت: (ئه‌گه‌ر به‌شێکی زۆرتان بدمنه پاڵ مقاوه‌مه و سه‌نگه‌ر له ئه‌مه‌ریکا و

هاوپەیمانەکانی بگرن، ئەوا لە چەند مانگێکی کەمدا دەریان دەپەڕێننە دەرەوە).

"تاریق عەلی " نموونەی ئەوانەیە لە ڕێی ئاسانکردنەوە، جیهان وەها نیشان دەدەن کە باش و خراپ زۆر بەزەقی لە وێنەکەدا دیارە و پێویست بەهیچ بیرکردنەوە و تێڕامانێک ناکات. هەر بۆیە ئەو مافە بەخۆیان دەدەن پێمان بڵێن، کێ بەرپرسیارە لە هەرچی نەهامەتی و هەڵە و ستەمکاری و ناڕەوایی و گەندەڵییەک کە هەیە. باشەکان ئەوانەن کە نەیار و ناحەز و دوژمنی ئەمەریکان و خراپەکانیش ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانین. ئەم چەپە ئازادیخواز و رادیکاڵە، چاوی بەعس و سیاسەتی جینۆسایدکردنی چل ساڵەی شۆڤێنیزمی عەرەبی نابینێت لە عێراقدا، لە بەرانبەردا خەمی لە گۆڕانی سەرمایەداری و شکست و پێکهێنانی ئیمپراتۆریای ئەمەریکی، کەسانی ناو موقاوەمەی عێراقی و "هۆگۆ چاڤێز" و "فیدڵ کاسترۆ" یان لە لا کردووەتە فریشتە و فریاڕەسی مرۆڤایەتی.

دواجار وەک بیرخستنەوەیەک دەبێت ئەوە بڵێم کە ئەو کتێبە سەتحی و زۆر تەنکەی " تاریق عەلی "، پڕیەتی لە نموونەی شیعری سەتحی و کەم خوێنی عەرەبی، نموونەکانیان وەک هەجوکردن و داشۆرینەکانی "موزەفەر نەواب و نزار قەبانی و سەعدی یوسف".

## ئیمپراتۆریا و بەرخودان

یەکێکی تر لەو کتێبانەی "تاریق عەلی " لە دوای یازدەی سێپتەمبەرەوە بڵاوی کردوونەتەوە و لەمسەرەوە تا ئەو سەری هەجوی ئەمەریکای تێدا دەکات، کتێبی (ئیمپراتۆریا و بەرخودان)ە.. ئەم کتێبە ئەوەندەی جاڕست دەکات و سووڕی خوێنت تێک دەدات، ئەوەندە چێژ و زانیاری دروستت پێ نابەخشێت. بۆ نموونە هەندێ رستەی تێدایە، ئێمە و مانان لە دەمی "سەدام حسێن" و سەرانی بەعسمان بیستووە، وەک ئەوەی دەڵێت: (گەر ئەمەریکا

هێرش بکاته سەر عێراق، ئەوا جیهانی عەرەبی دەتەقێتەوە و دنیا دەبێتە شوێنێکی نائارام و پڕ مەترسی).

دڵخۆشی و سەرسامی ئەم پیاوە بەمقاوەمەی عێراقی، دەگاتە ئەو ئاستەی بڵێت: (کاتی خۆی سەرۆک وەزیرانی کۆچکردووی ڤێتنام ڤام ڤان دیۆنگ دەیوت: ڕێگە بەرەو ژێتەرگێت بەناو جەنگەڵ و شارەکانی ڤێتنامی باکوردا تێپەڕ دەبێت.. ئەگەر چی مێژوو پێشبینی ناکرێت، بەڵام بەڵکو گۆڕانێک لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، بەهۆی ئەوەی لە فەلوجە و بەغدا دەقەومێت ڕوو بدات. بوش لەناو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بردییەوە، بەڵام ڕەنگە لە دەرەوە بیدۆڕێنێت. من بۆ خۆم ئاواتەخوازی ئەوەم!).

"تاریق عەلی " وەها وێنای پرۆسەی ئازادی عێراق دەکات، وەک قۆناغێک لە قۆناغەکانی دەسپێکردنەوە بەسیاسەتی کۆلۆنیالیزەکردنی ناوچەکە. ئەو پێی وایە گەر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا (فەرەنسا و بەریتانیا) بەو کارە هەستابن، ئەوا لەمڕۆدا ئیمپراتۆریای ئەمەریکی وەک تاکە زلهێزی دنیا، ئەو مێژووە دووبارە دەکاتەوە. بۆ بەرگرتن بەو پرۆسەیەش، بەپیتی درشت دەنووسێت: (پێویستە مقاوەمەی عێراقی زۆر جەسوورانە و بە چەک، ڕووبەڕووی ئەمەریکییەکان ببنەوە).

ئەم چەپە ڕادیکاڵە لە ململانێی لەگەڵ ئەمەریکا و سیستەمی سەرمایەداریدا، ئەو هەقیقەتەی لەبیر دەچێت کە مقاوەمەی چەکداری و توندوتیژی عێراق ناکاتە بەهەشت و سەرزەمینی ئازادی، لە دوای چوونە دەرەوەی ئەمەریکاییەکان. ئەزموونی ڕابردووی عێراق شایەدی ئەوەیە کە دوای چوونەدەرەوەی بەریتانیاییەکان لە عێراق، ئەو وڵاتە نەک هەر نەبوو بە بەهەشت و سەرزەمینی ئازادی و سەربەخۆیی، بگرە بووە دۆزەخێک بۆ ئەتککردنی ئازادی و ڕیسواکردنی مرۆڤ. قۆناغی دوای چوونە دەرەوەی

بەریتانیاییەکان لە عێراق، مێژوویەکە تا پرۆسەی ئازادی لە ساڵی ٢٠٠٣دا، بەعس بەخوێن و فرمێسک دەینووسێتەوە.

ئەو کاتەی "بوش" لە ساڵی ٢٠٠٢دا وڵاتانی (کۆریای باکور و ئێران و عێراقی) وەک بەرەی شەڕ و خراپەکاری وەسف کرد، "تاریق عەلی " لە بەرانبەردا (کوبا و فەنزوێلا و بۆلیڤیا)، وەک بەرەی ئومێد ناونووس دەکات و "چافێز و کاسترۆ و مۆرالیس" بە چەتەکانی کاریبی دەچوێنێ و لە جێی "جونی دیب و ئۆرلاندۆ بلۆم و کیراناتیلی " دایان دەنێت. واتە ئەوانە بەو جوامێرانە دەزانێ کە مافی خوراوی نەداران و بێنەوایانی جیهان، لە چنگ دەوڵەمەند و سەرمایەدارە چاوچنۆکەکان دەردێننەوە.

ئەم پیاوە سەیری دوژمنەکانی ئەمەریکا وەک فریادڕەسێک دەکات و وەکی فریشتەیەک نیشانیان دەدات. بڕوانە لەم کتێبەیدا چۆن باسی سەرکردەیەکی پڕۆپلستی و دیکتاتۆری وەک "هۆگۆ چافێز" دەکات: (چافێز مرۆڤێکی زۆر رۆحسووک و خۆشەویستە، کەسێکە عەقڵی کراوەیە و دەربایسی ئەوەیە فێربێت و شت بزانێت. خوێنەرێکی بەردەوامی کتێبە و زۆر دەخوێنێتەوە. ئەو وەک زۆرێک لە سیاسەتمەدارانی ئەمەریکا نییە.. زۆر ئاگادار و رۆشنبیرە. رەخنەی قبوڵە و حەزی بەگفتوگۆو را گۆڕینەوەیە. بەگشتی مرۆڤێکی بەهرەمەندە).

"تاریق عەلی " لەم کتێبانەیدا هەرچی هەوڵە بەخەرجی دەدات، بۆ دژایەتیکردن و نابووتکردنی هەوڵەکانی ئەمەریکا لە جیهاندا. بۆشی گرینگ نییە لەو دژایەتیکردنەدا، دەکەوێتە چ بەرەیەک و لە سەنگەردا شان بەشانی کێ دەوەستێ! وەک چۆن رق و دژایەتیکردنی ئەمەریکا، وڵاتێکی وەک فەنزوێلاو ئێران لێک نزیک دەکاتەوە و "ئەحمەدی نەژاد" و "هۆگۆ چافێز" دەکات بەدۆستی گیانی بەگیانی، ئاساییشە چەپێکی پەرگیری وەک "تاریق عەلی " و گرووپە ئسووڵییە توندڕۆکان، ببنە هاوپەیمان و هاوخەباتی یەکتری.

فەیلەسووفی بەناوبانگی سلۆڤینی "سلاڤۆی ژمیژەک" ساڵی ٢٠٠٢ کتێبێکی نووسی بەناوی (بەخێربێن بۆ بیابانی واقیع)، لەوێدا ئەویش وەک چەپێکی تووڕە و رادیکاڵ رەخنە لە سیستەمی نیو - لیبرالیزم و ئەمەریکا و سەرمایەداری دەگرێت و لە ئەلتەرناتیڤێکیش دەگەڕێت بۆ دنیای ئەمڕۆ، بەلام هیچ کات وەک "تاریق عەلی " ناکات و بەڕەوای نابینێ لە پاڵ بەربەرییەکانی تردا، دژایەتی بەربەریەتی سەرمایەداری بکات. چونکە لە دنیای ئەمڕۆدا، کەس رازی نییە بەوەی دۆزەخی سەرمایەداری ئەمەریکی، بەدۆزەخێکی دزێوتری وەک ئەوەی (تاڵیبان و قاعیدە)، "کاسترۆ" و " چاڤێز" بگۆڕێتەوە.



# قاعیدە لە سەردەمی "ئەیمەن زەواهیری"دا

"پێویستە شەڕ بەرینە ماڵی دوژمنەکانمان، تا دەستی ئەوانە بسووتێنین کە ئاگر لە ماڵەکانی ئێمەدا خۆش دەکەن".

-ئەیمەن زەواهیری-

## فێندەمێنتالیستە ئۆرستۆکراتەکان

"زەواهیری" و " بن لادن"، وەک دوو سەرەکیترین و کاریگەرترین تیۆرسین و سەرکردەی ڕێکخراوی قاعیدە، نموونەی ئەو فێندە مێنتاڵیستە ئۆرستۆکراتانەن کە لە بنەماڵەیەکی ناسراو و دەست ڕۆیشتوو خواپێداوەوە هاتوون. ئەمانە نموونەی ئەو کەسانەن کە خاوەن سەرمایەیەکی مادی و ڕەمزیی زۆرن و خاوەن بڕوانامەی بەرزن و بنەماڵەکانیشیان، لە بنەماڵە ناودار و دیارەکانی میسر و سعودیەن.

بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی سیاسی لە "حەسەن بەننا"وە تا ئەمڕۆ، هیچ یەک لە سەرکردە و کەسە دیارەکانی ناو گرووهە ئیسلامییەکان، وەک " ئەیمەن زەواهیری"و " ئوسامە بن لادن"، کوڕی خێزانە خواپێداوەکان نەبوون و وەک ئەوان لە سەرمایەی زۆری مادی و ڕەمزیی بنەماڵەکانیان بەهرەمەند نەبوون.

بۆ نموونە "زەواهیری"، کوڕی بنەماڵەیەکی ناسراوی میسرەو باووباپیرانی لەو کەسانە بوون کە پلەوپایەی بەرچاویان لە وڵاتدا هەبووە. "د. محەمەد زەواهیری" باوکی، یەکێک بووە لە پزیشکە بەناوبانگەکانی میسر و وڵاتانی عەرەبی. باپیری (واتە باوکی باوکی) یەکێک بووە لە شێخە دیارەکانی ئەزهەر. باپیرەکەی تری (واتە باوکی دایکی) کە "عەبدولوەهاب عەزامە"، یەکێک بووە لە کەسە ناودار و خاوەن دەسەڵاتەکانی میسر، لە پێش شۆڕشی یۆلیۆی ١٩٥٢دا. "عەبدولڕەحمان عەزام"ی براشی یەکەمین ئەمینداری کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی بووە. خاڵێکی ئەمینداری ئەنجوومەنی ئیسلامی ئەورووپی بووەو خاڵێکی تریشی جێگری سەرۆکی پارتی کاری میسری بووە.

"زەواهیـــری" بۆ خـــۆی لە ١٩٥١/٦/١٩، لە یەکـــێک لە گـــەڕەکـــە دەوڵەمـەندەکانی شاری قاهیـرەدا لەدایک دەبێت کە گەڕەکی (مـەعادی)یە. قۆناغەکانی خوێندنی بە سـەرکەوتوویی و پلەی بەرز بڕیوە. لە ناوەڕاستی حەفـتاکانی سـەدەی رابردوو لە زانکۆی قـاهیـرە، کۆلێجی پزیشکی تەواو دەکات و سـاڵی ١٩٧٨ لە نەشتەرگەری گشتیدا لە هەمـان زانکۆ، بڕوانامەی مـاسـتـەر وەردەگرێت. پاشـان هەر لەو بوارەدا (واتە بواری نەشـتـەرگـەری گشتی)، لە زانکۆکانی پاکستان بڕوانامەی دکتۆراش بەدەست دێنێ. ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ کچێکدا کە خوێندکاری بەشی فـەلسـەفـەی کۆلێجی ئاداب دەبێت، ژیانی هاوسەرگیری پێکدێنێت و ئێستا خاوەنی چوار کچ و کوڕێکە.

"زەواهیری" هەر لە سـەرەتای تەمـەنی لاوێتییەوە، سەرو کـاری لەگەڵ کاری ئیسلامـیـدا هەبووە و هەر زوو تێکەڵ بەگـرووپ و رێکخـراوە ئیسـلامـییـە نهێنییـەکان بووە. وەکو ئەوەی "مـونتـەسـر زەیات" لە کـتێبەکـەیدا باسی دەکـات: (زەواهیـری لە تەمـــەنی حـەڤـدە سـاڵییـەوە و بەتایبـەتیش دوای لەسێدارەدانی سـەید قوتب و پاشـانیش شکستی عەرەب و میسرییەکان لە شـەڕی شـەش رۆژەی ئیسـرائیلدا، دەبێـتە ئەندامی یەکێک لەو رێکخـراوە ئیـسـلامـیـیـە نهـێنیـیـانەی زۆربەی زۆریـان لەو گـەنجـانە بوون کـە لەژێر کاریگەری - في ظلال ومعالم في الطريق) دا بوون. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (منتصر الزيات: ايمن الظواهري كما عرفته، دار مصر المحروسة، القاهرة الطبعة الاولى، ٢٠٠٢).

لە میسردا کە لانکی ئیسلامی سیاسییە، ئەگەر تا شـەستەکانی سەدەی رابردوو جـڵـــەو و کـاری ئیـسـلامی لە دەست ئیـخـوان مـوسلمین و سەرکردەکانی ئەو رێکخراوەدا بووبێت، ئەوا لەو مێژووە بەدواوە ئەستێرەی بەختی هاوڕێیانی "حەسـەن بەننا" لە کزی دەدات و ئەوەی لە هەڵکشـان و درەوشـانەوەدا دەبێت، ئەو گـرووپ و دەسـتـە و تـاقـمـانەن کـە گـەنجـان

داینامۆین و بەرهەم و نووسینەکانی "سەید قوتب"یش مەشخەڵی ڕێیانە.

لە دوای (في ظلال ومعالم في الطريق وهذا الدين و المستقبل لهذا الدين) و بەتایبەتیش دوای لەسێدارەدانی خاوەنی ئەم بەرهەمانە، ئەوەیەک لەسەر گۆڕەپانی سیاسی وڵاتی میسردا سەر دەردێنێ کە بڕوای تەواوی بە جیهادی باسک و بازوو دەبێت و زەبرو زەنگ و توندوتیژیش، بەتاکە ستراتیجێک دەبینێ بۆ گەیشتنە کورسی حوکمڕانی و گۆڕینی نەخشەی سیاسیی وڵات و دەستکاریکردنی خەریتەی کۆمەڵایەتی.

هەر بۆیە لە سەرەتای حەفتاکانەوە، بارەگاکانی ئیخوان موسلمین دەبێتە شوێنی پیاوە ئیختیار و بەساڵاچووەکان و گەنجەکانیش لەناو گرووپ و ڕێکخراوی ئیسلامی رادیکاڵ و جیهادیدا، خۆیان ڕێک دەخەن."زەواهیری" یەکێکە لەو گەنجانەی لەگەڵ کۆمەڵە هاوڕێیەکیدا و لەناو ڕێکخراوێکی نهێنی پەرگیردا خۆیان ڕێک دەخەن کە دواتر بەڕێکخراوی (جیهاد) دەناسرێت. بڕوانە: (منتصر الزيات: الطريق الى القاعدة). ئەوەی چانسی گەورەبوون و بەهێزبوونی ئەم کۆمەڵە و ڕێکخراوە ئیسلامییانە زیاتر دەکات، ئەو فەزا سیاسییە تازەیە کە لە حەفتاکاندا و لەگەڵ هاتنی "ئەنوەر سادات" دا دێتە پێش.

"سادات" لە دوای مردنی "عەبدولناسر" و دەستبەکاربوونی وەک سەرۆک کۆماری میسر، بەمەبەستی لێدانی تەواوی هێزە لیبراڵی و مارکسی و ناسری و ناسیۆنالیستەکان، دەکەوێتە هاوپەیمانێتی بەستن لەگەڵ ئیسلامییەکاندا و سالآنی حوکمڕانی ئەو، ئیسلامییەکان لە کار و چالاکی نواندندا تا ئەوپەڕی ئازاد و دەستکراوە دەبن و تارادەیەکی زۆریش دەتوانن، لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە کۆنترۆڵی وڵات بکەن. خوێنەر بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەلومەرجی ئەو قۆناغەی وڵاتی میسر، دەتوانێت سەیری ئەم سەرچاوانە بکات:

(د.عبدالعظيم رمضان: جماعات التكفير في مصر، الاصول الفكرية والتأريخية الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة الطبعة الاولى، ١٩٩٥). يان (هالة مصطفى: الاسلام السياسي في مصر مركز الدراسات السياسية والاستراتيجية بالآهرام، القاهرة الطبعة الاولى، ١٩٩٢). ياخود (أحمد حسين حسن: الجماعات الاسلامية والمجتمع المدني دراسة في استراتيجية بناء النفوذ السياسي والاجتماعي والتغلغل الفكري دار الثقافة للنشر، القاهرة الطبعة الاولى،٢٠٠٠).

حەفتاكان ئەو قۆناغەیە كە گرووپە جیهادییە رادیكاڵییە ئیسلامییەكانی ناو میسر، دەگەنە ئەوجی بەهێزبوون و پەلوپۆ هاویشتن و گەورەبوون. ئەمەش هەر بەتەنیا بەسیمای ناوچە چەپەك و دوورە دەستەكانەوە دیار نابێت، یان لە كووچە و كۆڵانە نەدار و هەژار نشینەكانی قاهیرە و پۆرسەعید و ئەسیوتدا هەستی پێ ناكرێت، بگرە لەناو زانكۆ و پەیمانگا و سەندیكاكانی كۆمەڵگەی مەدەنی و داو و دەزگا حكوومی و شەقام و گۆڕەپانە گشتییەكاندا، بەزەقی خۆی بەیان دەكات.

ئەو دوو رێكخراوە ئیسلامییەی لەم قۆناغەدا، پڕكێشی زیاتر دەكەن و خەونی گەورەتریان دەبێت (كۆمەڵی ئیسلامی و رێكخراوی جیهاد)ن. هەر ئەم دوو رێكخراوەشن كە لە دوای ئیمزاكردنی رێكەوتنامەی كامپ دێڤدەوە، كار بۆ ئەوە دەكەن دەسەڵاتەكەی "ئەنوەر سادات" نابووت كەن و لە رێی كۆدێتایەكی سەربازی كتوپڕەوە، جڵەوی حوكمڕانی لە میسردا بگرنە دەست.

ئەوەی لە شەشی ئۆكتۆبەری ساڵی ١٩٨١دا روودەدات، لەلایەن "خالد ئیسلامبولی"و "محەمەد عەبدولسەلام فەرەج"ەوە، نیشانەی خواست و بڕوا بەخۆبوونی ئەو دوو هێزە ئیسلامییە رادیكاڵەیە كە دەتوانن بە كەماڵی ئیسراحەت، كەسی یەكەمی وڵات تیرۆر بكەن و كورسی حوكەڕانی بگرنە دەست.

بێگومــان ئەم هەوڵە ئەگــەرچی دەســتی دەگــاتە ئەوەی ڕۆحی "ئەنوەر سادات" بکێشێ، بەڵام لە گەیشتن بەکورسی دەسەڵات شکست دێنێ. باجی گەورەی ئەم شکستەش، هەریەک لە (کۆمەڵ و جیهاد) دەیدەن. ئەو شاڵاوی ڕەشــبگیــرییــەی لە دوای ڕووداوەکــەوە دەست پێ دەکــات، لە بەرواری ۲۳/۱۰/۱۹۸۱دا دەگـاتە ســەر "زەواهیــری"و مــاوەی سێ ســاڵ زیندانی بەسەردا دەدرێت. دوای ئیعترافکردنی لەسەر چەند هاوڕێیەکی کە یەکێک لەوانە "عـیـســام قــەمـری" دەبێت کــە پاش گــرتنی لەسـێـدارە دەدرێت، "زەواهیـری" ئازاد دەکرێت. دوای ئەوە ڕوو دەکاتە ئەمەریکا و سویسـرا و سـعـودیە و پاکسـتـان و ئەفـغـانـسـتــان و "مـونتـەسـر زەیات" پێی وایە: (زەواهیری بۆیە دوای ئەوە سەری خۆی هەڵدەگرێت و وڵات بەیەکجاری جێ دێڵێت، چونکە لە پای ئیـعتـرافکردنی لەسـەر هـاوڕێکانی و لەسێـدارەدانی یەکێکیان، تووشی ئازارێکی ویژدانی زۆر دێت و دەروونی ماندوو دەبێت).

"زەواهیـری" دوای ئەوەی لە ســاڵی ۱۹۸۵ لە شــاری بیـشــاوەر لە ناوچە سنوورییەکانی پاکستـان و ئەفغانستاندا دەگیرسێتەوە، وەک پزیشکێکی خــۆبەخش لە یـەکێک لە نەخـۆشــخـانەکـانی مـانگی سـووری کـوەیتـیـدا دەسـتـبـەکـار دەبێت و بەمـاوەیەکی کـەمـیش دوای ئەوە، ئاشنـایەتی لەگـەڵ "ئوسـامـە بن لادن"دا پەیدا دەکات و دەبنە دۆست و هـاوڕێی گیانی بەگـیـانی یەکـتـری. ئەم دۆسـتـایەتی و یەکـتـرناسـینـەیان، دەبێـتـە بەردی بنـاغـەی دامـەزراندنی ترسناکترین و گەورەترین ڕێکخـراوی ئیسلامی جیهادی کە ڕێکخراوی قاعیدەیە.

## قاعیدە لە نێوان "زەواهیری و بن لادن"دا

وەک چۆن مێژوو ئەوە بۆ میسرییەکان دەنووسێت کە ئەوە ئەوان بوون بۆ یەکەم جارو دوای هەرەسـهێنانی خـەلافەتی عوسمـانی، یەکەمین ڕێکخـراوی ئیسـلامی سیـاسـیـان دروست کرد، ئەوا ئەوەشیـان بۆ تۆمـار دەکـات کە

هەڵسووڕاوانی ئەوان بوون بەردی بناغەی ڕێکخراوێکی وەک قاعیدەیان داناو گەیاندیانە ئەو ئاستەی کە ببێتە هەڕەشەیەکی جیددی، بۆ سەر ئەمەریکا و ڕۆژئاوا و تەواوی جیهان بەگشتی. ئەوە ڕاستە کە قاعیدە بەهەوڵ و ڕەنجی کەسانی وەک "عەبدوڵا عەزام" و "ئوسامە بن لادن" هاتووەتە بەرهەم، بەڵام پشکی شێر لەسەرپێ خۆکەوتنی ئەم ڕێکخراوەدا، بەر میسرییەکان دەکەوێت.

میسرییەکان لەناو ڕێکخراوی قاعیدەدا، ڕۆڵیان ڕۆڵی ئەو سەربازە نەناسراوانەیە کە لە پشتی پەردەوە و لە سێبەردا کار دەکەن. "سەید ئیمام" و "ئەبوعوبەیدەی بەنشێری" و ئەبو حەفسی میسری"و سەیفو لعەدل" و "محەمەد سەلاح" و "تاریق ئەنوەر" و"زەواهیری" و... هتد، چ لە ڕووی سەربازی و چ لە ڕووی تیۆری و سیاسی و کاری ڕێکخراوەییەوە، شوێن دەستیان بەزەقی بەسەر مێژووی قاعیدەوە دیارە. ڕەنگە بواری دارایی تاکە بوارێک بێت کە میسرییەکان وەک پێویست خزمەتیان بەقاعیدە نەکردبێت، بەڵام لە بوارەکانی تردا ئەوان سەر مەشق بوون و سیاسەتی گشتی ڕێکخراوەکە لەبن هەنگڵی ئەواندا بووە.

ئەوە ڕاستە کە "بن لادن" تامردنی ڕووی دیار و کەسی یەکەمی قاعیدە بووە، بەڵام ئەو ئەقڵەی بیری دەکردەوە و تیۆریزەی دەکرد و پلان و سیاسەت و بەرنامەی کاری ڕێکخراوەکەی دادەڕشت، "زەواهیری" بوو. بەکورتی و بەپوختی وەک "برۆس هۆفمان"ی پسپۆڕ لە بواری تیرۆردا لە دیمانەیەکی کۆواری (نیوزویک)دا دەڵێت: (زەواهیری ئەو ئەقڵەیە کە قاعیدە بیری پێ دەکاتەوە و سندووقە ڕەشەکەی ئەو ڕێکخراوەیە).

قاعیدە بەرهەمی هەوڵی ئیسلامیستە پەرگیرە میسرییەکانە، لە پێشی پێشەوەشیاندا "زەواهیری". ئەم پیاوە لەساڵی ١٩٨٦ تا ١٩٩٨ کە مێژووی خۆ ئیعلانکردنی قاعیدەیە، توانی بەهەوڵ و کۆششێکی زۆر،

وەرچەرخانێکی ریشەیی و ستراتیجی لە بیرکردنەوە و دنیابینی "ئوسامە بن لادن"دا دروست بکات. توانی قەناعەتی پێ بکات کە باوەڕ بەهێزی جیهادی رادیکاڵانە بێنێ، واتە دەست بەرداری ئەوە بێت تەنیا وەک بانگخوازێکی سەلەفی بمێنێتەوە کە هەر سەرقاڵی کاری خێرخوازی دەسگیرۆییکردن و کۆمەک پێکردن بێت. بگرە ئەوەی "زەواهیری" دەیویست ئەوە بوو، "بن لادن" بگۆڕێت بۆ جەنگاوەر و موجاهیدێک، تا جیهاد لە دژی تاغووتەکانی جیهانی ئیسلامی بەرپا بکات و هێزەکانی ئەمەریکاش لە وڵاتانی عەرەبیدا وەدەرنێت. ئەڵبەت دواجار ئەمەشی بۆ چووە سەر.

ئەوەی راستی بێت "زەواهیری" چەند کاریگەری لەسەر کارەکتەری "بن لادن" بەجێ هێشت، "بن لادن"یش کاریگەری لەسەر "زەواهیری" و ئاڕاستەی بیرکردنەوەی ئەو هەبووە."زەواهیری" تا ئەو کاتەی کەسی یەکەمی ناو بزووتنەوەی (جیهاد)ی میسری بوو، بڕوای وابوو (رێگای رزگارکردنی قودس، بەقاهیرەدا تێپەڕ دەبێت) و هەمیشە پێداگیری دەکرد لەسەر ئەوەی کە (موسڵمانی راستەقینە، سەرەتاو بەر لەهەر شتێک پێویستە بەرەنگاری کوفری ناوەخۆ و دوژمنی نزیک بێتەوە. دوای ئەوە نۆرە دێتە سەر کوفری دەرەکی و دوژمنە دوورە دەستەکان). ئەم قەناعەتە بوو وای لێ کرد لە کاتی دەرچوونی لە میسرەوە تا دروستبوونی قاعیدە، داوا لە جیهادییەکانی میسر بکات لەسەر کار و چالاکی خۆیان بەردەوام بن، سەرەڕای ئەو گورزە گەورە و کوشندانەشی لە پای هەوڵە شکتسخواردووەکانیان بۆ تیرۆرکردنی "صەفوەت شەریف و عاطف صدقی و حەسەن ئەلفی"، بەریان کەوت.

ئەوە "بن لادن" بوو " زەواهیری" وا لێ کرد واز لەو سیاسەتانەی بێنێت و دەستبەرداری شەڕە لۆکاڵییەکانی بێت، بۆ خاتری شەڕێکی گەورەتر و چارەنووسسازتر کە شەڕی سەرتاسەرییە لە دژی ئەمەریکا و هاوشێوەکانی. ئەو قۆناغ و سەردەمەی "بن لادن" ئەم پێشنیازانەی

بەردەستی "زەواهیری" دەخست، ڕێکخراوی جیهاد لەناو میسردا دووچاری پشێویەکی گەورە بووبوو، لە ڕووی ڕێکخستن و کارکردنی هەڵسووڕاوەکانییەوە، هاوکات سەرچاوەی داراییشیان بەرەو لاوازی و کزبوون دەچوو. ئەمانە هۆکارگەلێک بوون وایان لە "زەواهیری" کرد، ڕێکخراوی جیهاد هەڵبوەشێنێتەوە و تێکەڵ بەعەرەبە ئەفغانییەکانیان بکات و قاعیدەیان لێ دروست بێت.

لێرەوە وەک چۆن " بن لادن" ڕازی بوو بەوەی واز لە ڕۆڵی خێرخوازی سەلەفی بێنێ و ببێتە موجاهیدێکی هەقیقی، "زەواهیری"یش هاتە سەر ئەو قەناعەتەی واز لە خەباتی لۆکاڵی بێنێ و جیهادی دوژمنە دوورەکان دەست پێ بکات. بەم جۆرە هەردووکیان لە ژێر چەتری قاعیدەدا کۆدەبنەوە و سەرەتایەکی تازە دەست پێ دەکەن کە یەکێکە لە قۆناغە ترسناک و خوێناوییەکانی ئیسلامی سیاسی لە مێژوودا.

## "زەواهیری" وەک کەسی یەکەمی قاعیدە

"زەواهیری" لە ئان و ساتێکدا بەشێوەیەکی فەرمی دەبێتە کەسی یەکەمی ناو ڕێکخراوی قاعیدە کە زۆر هاوکێشە گۆڕاوە و زۆر شت وەکی خۆی نەماوە. بەتایبەت ئەگەر ڕووداوەکانی ئەمساڵ وەرگرین کە گرینگترین و دیارترینیان بریتییە لە (کوژرانی بن لادن و شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی بەهاری عەرەبی و تیرۆرکردنی ئەنوەر ئەلعەولەقی و... هتد).

ڕاستە لە دوای شەڕی دژە تیرۆر و وشککردنی سەرچاوە دارایییەکانی قاعیدە و ڕووخاندنی حکوومەتی تالیبان لە ئەفغانستان و دەستگیرکردنی زۆربەی زۆری هەڵسووڕاوە دیارەکانی قاعیدە، ئەو ڕێکخراوە لە پاشەکشەدایە و توانای دەست وەشاندن و پەلاماردانی ڕوو لە کزییە، بەڵام هیچ یەک لەوانە هێندەی ڕووداوەکانی ئەمساڵ لەسەر شانی قاعیدە قورس و تاقەتپڕووکێن نەبوون.

قاعیدە لە سەرەتاکانیدا، هێزێکی پۆشتە و پەرداخ و ڕێکخستنێکی کۆنکرێتی هەبوو. خاوەنی لەشکرێکی گەورەی موجاهید و جەنگاوەران بوو. لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە جوگرافیایەکی پارێزراوی هەبوو، لەژێر سایەی حوکمڕانی تاڵیباندا لە ئەفغانستان. هەنووکە کە "زەواهیری" بەرپرسیارێتی ئەو ڕێکخراوە لە ئەستۆ دەگرێت، هیچ یەک لەوانە نەماوە. سەرباری تیرۆرکردنی "بن لادن" و ئەلعەولەقی"یش، بەهاری عەرەبی و دەنگ و سەدای لاوانی ئەو وڵاتانە، بەرەی لەژێر پێی قاعیدە و هێزە ئیسلامییەکانی تردا دەرکێشاوە.

لە ڕاستیدا ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لە ئێستادا، بەرادەیەک گەمارۆی قاعیدەیان داوە کە رەنگە "زەواهیری" و "سەیفولعەدل" و "ئەبو لەیسی لیبی"، سەریان نەپەرژێتە سەر ئەوەی دووبارە ڕێکخراوەکە بخەنەوە سەرپێی خۆی و لەژێرباری قورسی مەرگی "بن لادن" دا دەری بێنن.. ئەوەی لەم قۆناغەدا مومکین بێت، لەوانەیە پاراستنی سەری خۆیان و قوتارکردنی گیانی خۆیان بێت، نەک بووژاندنەوە و هەستانەوەی قاعیدە بێت. ئەوەی لە ئێستاشدا دەیبینین، بەڕوونی نیشانی دەدات کە یاریکەری دیاری سەر گۆڕەپانەکە لەمڕۆدا، تاڵیبانی ئەفغانستان و تاڵیبانی پاکستان و بزووتنەوەی حەقانییە، نەک قاعیدە. بەکورتییەکەی "زەواهیری" لە دۆخێکی دژوار و ئاڵۆزدا، ئەو بەرپرسیاریەتییەی بەرکەوت کە رەنگە قورسترین قۆناغی ژیانی ڕێکخراوەکەی بێت.

سەرەڕای ئەوانە لێرە و لەوێ باس لەو کێشە و ناکۆکییە ناوەخۆییانەی ڕێکخراوەکەش دەکرێت کە لە نێوان سعودییەکان و میسرییەکاندا هەیە و پێشبینی دەکرێت زۆرێک لە سعودییەکانی ناو عاقیدە، مل بە "زەواهیری" نەدەن و وەک کەسی یەکەم قبووڵیان نەبێت."زەواهیری" و قاعیدە لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی قورس و ئان و ساتێکی چارەنووسسازدان. ئەم ئاستە

لاواز و پڕ پەرتەوازەییـیەی ئەم ڕێکخراوە تووشی بووە، بەرهەمی دە ساڵی هەوڵ بەخەرجدانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە. بۆیە بەدوور دەزانرێت جارێکی تر ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی ڕێگە بدەنەوە، قاعیدە خۆی ڕێک بخاتەوە و سەر پێی خۆی بکەوێتەوە.

قاعیدە چی لێ دێت و بەرەو کوێ دەچێت؟ ئەمە گرینگترین پرسیارێکە کە لە سەردەمی "زەواهیری"دا دێتە پێشێ، وەک کەسی یەکەمی ئەو ڕێکخراوە.

"قاعیدە" لە سەردەمی "زەواهیری"دا یان کۆتایی پێ دێت و بچووک دەبێتەوە و دەچێتە پەراوێزی مێژووەوە، یان بەفۆرم و شێوازێکی دییەوە دێتەوە سەر گۆڕەپانەکە.. ئەوەی ئێستا لە دنیادا ڕوو دەدات، ئەگەری یەکەمیان زیاتر دەکات. ئەم ئەگەرەشیان بۆ مرۆڤایەتی خێری زیاتری تێدایە، چونکە ژیان لە بەڵای فاشیزمێکی دی قوتاری دەبێت و ئەگەری دووبارە بوونەوەی یازدەی سێپتەمبەرێکی تریش لاواز دەکات.

تۆ بڵێی دە ساڵ دوای یازدەی سێپتەمبەر، وەک چۆن مەرگی "بن لادن" و "ئەنوەر ئەلعەولەقی" و بەهاری عەرەبیمان تێدا بینی، کۆتایی (قاعیدە)یشی تێدا ببینین. بێگومان داهاتوو وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە.




# سەید قوتب تەکفیر و توندوتیژی

"مـردنی کـەسـانێک لەپێناو ئایدیایەکـدا، ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو ئایدیایە راست و دروستە".

## سەرەتایەکی پێویست

"سەید قوتب" ناوێکی دیار و تیۆرسینێکی گەورەی ناو مێژووی ئیسلامی سیاسییە. هەرچەندە تەمەنی کارکردنی ئەو لەناو بزاوتی ئیسلامیدا (کە ئیخوان موسلمین بوو) لە سێزدە ساڵێکی تێنەپەڕاند (١٩٥٣- ١٩٦٦)، بەلام لەو ماوە کەمەدا توانی میراتییەکی گەورە و کاریگەرییەکی بێحەد و حیساب لە دوای خۆی جێ بهێڵێت و تا ئەمڕۆش، شوێن دەستی بەزەقی بەسەر تەواوی گرووپە رادیکاڵی و جیهادییەکانی دنیاوە دیارە.

لە دوای هێرش و پەلامارەکانی قاعیدە بۆ سەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە یازدەی سێپتەمبەری ٢٠٠١، زیاد لە جاران ناوی "سەید قوتب" و بەرهەمە فیکری و ئایدیۆلۆجییەکانی هاتنەوە ناو ناوان و بوونە شوێن گرینگی پێدانی هەموو لایەک.

بەدرێژایی ئەم دە ساڵە، یەکێک لەو پرسیارە چەندبارە و بەردەوامانەی دەکرێت و دەکرێتەوە ئەوەیە: (کە ئاخۆ هزری سەید قوتب و تێزە و تیۆرەکانی، تاچەند پێوەندییان بەگرووپەکانی تەکفیر و پرسی جیهاد و تیرۆرەوە هەیە؟ ئاخۆ سەید و بیر و بۆچوونەکانی بەپرسیارن لەو کار و کردەوانەی، قاعیدە و گرووپە تەکفیرییەکانی دی لە سەرتاسەری جیهاندا ئەنجامی دەدەن یان نا؟).

بێگومان ناوهێنانی بەردەوامی "سەید" نەک کەسێکی دی، لەو مەسەلانەی پەیوەندییان بەتیرۆر و جیهاد و کاری خۆتەقاندنەوە و تەکفیرکردنی کۆمەڵگە و دەوڵەتەوە هەیە، ئەوە دەسەلمێنێ کە دید و بۆچوونی ئەو و ئەو میراتییە فیکرییەی لە پاش مردنی خۆی جێی دێڵێت، پێوەندییەکی ئۆرگانی

و رێک و راستیان بەو کردەوەو کار و چالاکییانەوە هەیە کە ئیسلامی رادیکاڵی لێرە و لەوێ پێی هەڵدەستێت. تاوتوێکردنی بەرهەمەکانی و بەتایبەتیش نووسینەکانی ناو زیندانی (في ظلال، هذا الدين، مستقبل لهذا الدين، معالم في الطريق، لماذا أعدموني؟)، بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرن لەو رووەوە.

## "مەودوودی" نەک "حەسەن بەننا"

کەس نکۆڵی لەوە پێ ناکرێت کە گوتاری "سەید قوتب"و دید و بۆچوونەکانی، چەقی گوتاری ئیسلامی هاوچەرخ پێک دێنێت. وەک "تاریق ئەلبشری"یش لە وتارێکیدا بەناوی (سيد قطب.. قراءة تأريخية) دەڵێت: (تایبەتمەندی هزری سەید قوتب لەوەدایە کە کاریگەری زۆری لەسەر مێژووی هزر و بزاوتی ئیسلامی سیاسی پاش خۆی هەیە.. هیچ بزاوتێکی جیهادی و رادیکاڵی ئیسلامی نییە لە دنیادا، میراتی فیکری سەید سەرچاوە و مەرجەعی نەبێت). بڕوانە: (سيد قطب والعنف والتكفير: أزمة أفكار... أم مشكلة قراءة؟ - أعداد وتحرير: د. معتز الخطيب مكتبة مدبولي، القاهرة - الطبعة الأولى، ٢٠١٠).

"سەید" سەروەختێک تێکەڵ بەئیسلامی سیاسی دەبێت کە میسر لەبەردەم قۆناغی گۆڕانکارییەکی تازەدا دەبێت، قۆناغی کۆتاییهێنان بەسیستەمی حوکمڕانی پاشایەتی و دەرهێنانی وڵات لە بن دەستی کۆلۆنیالیزمی بەریتانی.

پێوەندی ناجۆری "عەبدولناسر" و ئیخوان لەو قۆناغەدا، دەبێتە باعیسی ئەوەی"سەید" وەک تیۆرسین و هەڵسووڕاوێکی دیاری ئیخوان، بەشێکی زۆری دوا ساڵەکانی تەمەنی لە زینداندا بەرێتە سەر. لەوێشدا وەک "تیمۆنی میشێل" دەڵێت: (جۆرە نووسینێکی بەرهەم هێنا کە دەکرێت بەئەدەبی زیندان ناوزەد بکرێت). یەکێک لە بەرهەمەکانی ئەم قۆناغە کتێبی

(مەشخەڵی ڕێ) بوو، ئەو مەشخەڵی ڕێیەی دەکرێت بەمانیفێستی تەواوی بزاوتە ئیسلامییە ڕادیکاڵییەکانی دنیای دابنێین.

"سەید"بەم کتێبەی ئاڕاستەی کاری ئیسلامی سیاسی دەگۆڕێت و دەبێتە مایەی ئەوەی، بۆ یەکەم جار ڕێکخراوی ئیخوان موسلمین (ئەو ڕێکخراوەی ساڵی ١٩٢٨ شێخ حەسەن بەننا لە شاری ئیسماعیلیە دای مەزراند)، ببێتە دوو کەرت لە نێوان حەرەسی کۆن و گەنجەکاندا. ئەو حەرەسە کۆنانەی داوای دان بەخۆداگرتن و پشوودرێژی و هەنگاوی شێلگیرانەیان دەکرد، لەگەڵ ئەو نەوە تازەیەی بڕوای بەپەلاماردان و کودەتا و جیهادی باسک و بازوو هەبوو.

"سەید" ئەگەرچی تیۆرسێن و هەڵسووڕاوی ئیخوان موسلمین بوو، بەڵام لە زینداندا ئەوەندەی سەروکاری لەگەڵ "ئەبوئەعلای مەودوودی" دا بوو، ئەوەندە بایەخی بەکار و بەرهەمەکانی "حەسەن بەننا" نەدا. واتە بەدرێژایی ساڵانی ناو زیندانی (لیمان گرە) رووی لە"مەودوودی"و پشتی لە"بەننا" بوو.

ئەمەش وای کرد لە ناوەڕاستی شەستەکان بەدواوە، بزاوتی ئیسلامی سیاسی لە میسر، بەگوتارێکی داخراو بگات و دواتریش بزاوتگەلێکی تری ئیسلامی لە جیهاندا، تووشی ئەو پەتایە ببن. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (د. محمد حافظ دیاب : سید قطب الخطاب والایدولوجیا – رؤیة للنشر والتوزیع، القاهرة – الطبعة الأولى،٢٠١٠).

ئاشکرایە لەگەڵ هاتنی ئیخوان و بەتایبەتی لە ساتەوەختی دروستبوونی (دەزگای تایبەت) لەناو ئەو ڕێکخراوەدا، تیرۆر و کاری توندوتیژی دێتە ئارا. هاوکات رەخنەگرتن و تەرێزکردن لە مۆدێرنە و غەربزەدەیی دەست پێ دەکات، بەڵام تەنیا لەگەڵ هاتنی "سەید قوتب" و بەرهەمهێنانی گوتارێکی داخراو و توندوتیژ لەسەر بنەمای چەمکگەلێکی وەک: (حاکمییەت و جاهیلیەت و تەکفیر و... هتد)، ئەو شتانە لە حاڵەتەوە دەبنە دیاردە و دەبنە

هەڕەشە و مەترسی جیددی، نەک لەسەر حکوومەت و دەسەلاتێکی دیاریکراو، بگرە بۆ سەر خودی ژیان خۆشی. لە نموونەی حوکمڕانی تالیبان لە ئەفغانستان و کار و کردەوەکانی (قاعیدە)ش لە جیهاندا، بەئاشکرا ئەوەمان بینی.

بێگومان ئێمە لەگەڵ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا، هەوڵی لیبراوانەی ریفۆرمخوازەکانی وەک: "جەمالەدینی ئەفغانی" و "محەمەد عەبدە" و "عەبدولرەحمان کەواکبی" دەبینین، بەمەبەستی دروستکردنی پردی پێوەندی لە نێوان کەلەپووری ئیسلامی و مۆدێرنەی ئەورووپی و رامالینی کەند و کۆسپەکانی رابردوودا، بەلام هەر زوو ئەم هەولانە بەهۆی پاشەکشەی "محەمەد رەشید رەزا" و دروستکردنی ئیخوان لەلایەن "حەسەن بەننا" وە کاڵ دەبنەوە و سەرکەوتوو نابن.

ئەگەر هەولی "حەسەن بەننا" و رێکخراوە سەلەفییەکەی، بەرگرتن بووبێت بە شالاوی رۆئاواخوازی و شارستانییەتی مادی رۆئاوا، لە رێی گەڕانەوە بۆ نۆرم و بەهاکانی ئیسلام و ئاشتکردنەوەی خەڵک و خوا لەگەڵ ئایندا، ئەوا "سەید قوتب" پشت ئەستوور بە مەرجەعییەتی "مەودوودی"، لە قۆناغێکی تردا دێت بۆ ئەوەی بکەوێتە شەڕێکی دەستەویەخەی بێ ئامانەوە، نەک لەگەڵ رۆئاوا و مۆدێرنەی پڕ لە ئیلحاددا بەتەنیا، بگرە لەگەڵ تەواوی ئەو کەسانەشدا کە بەخۆیان دەڵێن موسلمان و لەگەڵ ئەو دەوڵەت و نەتەوانەشدا کە خۆیان بە ئیسلامی دەزانن.

بەو پێیەی ژێرخانی گوتار و بەرهەمەکانی "سەید قوتب"، دنیابینی و تێزەو تیۆرەکانی" ئەبو ئەعلای مەودوودی" دروستی دەکات، ئەوا دەبێت بۆ پرسی تەکفیر و توندوتیژی و مەسەلەگەلێکی تر کە پێوەندی بەوانەوە هەیە، بگەڕێینەوە لای "مەودوودی".

"مەودوودی" ئەو پیاوەیە کە لەناو جەرگەی هیندستانەوە و لە سەروبەندی

سەربەخۆبوونی ئەو وڵاتەدا، دەتوانێت (حاکمیەت و جاهیلیەت و تەکفیر و جیهاد و... هتد)، لە چەمکگەلێکی رووت و ئەبستراکتەوە بگۆڕێت بۆ گوتارێکی ئایدیۆلۆجی کاریگەر و بیانکاتە زادی فیکری، موجاهیدانی ئیسلامی سیاسی و چەمکێکی کارا بۆ بەگژاچوونەوەی دنیا.

ئەوە "مەودوودی" یە لە سەردەمی هاوچەرخیدا بۆ یەکەم جار، دەرگا بەڕووی بەکارهێنانی چەمکی تەکفیردا دەکاتەوە و چەمکی جاهیلییەتیش وەک ئامرازێکی مەعریفی بەکاردێنێ، بۆ رەتکردنەوە و ئافەرۆزکردنی هزر و فەلسەفەی رۆئاوا. هەروەها وەک ئامرازێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیش بەکاری دێنێ، بۆ بەگژاچوونەوەی ئەو شێوازی ژیانکردن و کۆمەڵگە و ئەو سیستەم و رێژیمانەی لە هیندستان و تەواوی جیهاندا لە ئارادا بوون. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم مەسەلەیە بڕوانە: (د. عبدالغني عماد: حاكمية الله و سلطان الفقيه قراءة في خطاب الحركات الاسلامية المعاصرة دار الطلعية للطباعة والنشر، بيروت).

ئەو گرێی چەوساندنەوە و ژێردەستییەی "مەودوودی" لە فەزای وڵاتێکی وەک هیندستانداو وەک کەمینەیەکی موسڵمان لە بەرامبەر زۆرینەیەکی هندۆسیدا هەستی پێ دەکرد، وای لێ کرد گوتارێکی پەرگیر و داخراو بەرهەم بێنێت. گوتارێک کە تەرێز لە هەموو دەستکەوتەکانی مۆدێرنە بکات، بە ناسیۆنالیزم و دیموکراسیشەوە.

بە بۆچوونی ئەو دیموکراسی تەوقێکی ئاسنین بوو کە بۆ هەتا هەتایە دەکرایە ملی موسڵمانانی هیندستان، چونکە پێی وابوو دیموکراسی لە وڵاتێکی وەک هیندستاندا، واتە ملکەچکردنی موسڵمانان وەک کەمینەیەک بۆ هندۆسەکان کە زۆرینەی وڵات پێکدێنن. ئەڵبەت ئەم بۆچوونانەی ئەوە کە کەسێکی وەک "محەمەد عەلی جەناح" ناچار دەکەن، بەپێکهاتنی حیزبێکی ئیسلامی بەناوی (یەکگرتووی ئیسلامی) و هەوڵی ئەو حیزبەش بۆ ئەوە

دەبێت، تا دەوڵەتێک بۆ موسڵمانانی ناو هیندستان دروست بکات کە دواتر وڵاتی پاکستانی لێ دەکەوێتەوە، بەڵام "مەودوودی" هەر بەوە داناکەوێت و لە دوای دامەزراندنی پاکستانیش پڕکێشی زیاتر دەکات. بەکورتییەکەی لە ڕێی دروستکردنی پارتێکی سیاسییەوە و بەناوی (کۆمەڵی ئیسلامی)، دەیەوێت دەوڵەتێکی ئیسلامی دابمەزرێنێت.

واتە "مەودوودی" تەنیا دڵی بەوە ئاو ناخواتەوە کە پاکستان دەوڵەتێک بێت، بۆ موسڵمانان و جوگرافیایەک بێت لە چوارچێوەیدا موسڵمانانی جیابووەوە لە هندستان کۆ بکاتەوە، بگرە خوازیاری ئەوەیە پاکستان ببێتە دەوڵەتێکی ئیسلامی و وەک خۆی دەڵێت: (دەوڵەتێک بێت کار بە بەرنامە و شەریعەتی خوا بکات). ئەڵبەت ئەم خواست و بەرنامە پەڕگیرییانەی، دواتر بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەت و دەسەڵاتی وڵاتی دەبەن و لە مردن نزیکی دەکەنەوە.

ئەگەر سازش و پاشەکشێکردنی نەبوایە لە بۆچوونە زۆر پەڕگیرەکانی، ئەوا بێگومان هەمان چارەنووسی "سەید قوتب"ی دەبوو. "مەودوودی" پوختەی بۆچوونەکانی لەوەدا کورت دەکاتەوە کە لە هەر شوێنێکدا حاکمیەتی خوا غائیب بوو، واتە کار بە بەرنامە و شەریعەتی یەزدان نەکرا، ئەو کۆمەڵگە و دەسەڵاتە کافرن و لە جاهیلیەتی تەواودا دەژین. لەبەرئەوەشی کۆمەڵگەکانی دنیا، بەو کۆمەڵگەیانەشەوە کە بەخۆیان دەڵێن ئیسلامی لەو دۆخەدان. کەواتە نەک هەر موسڵمان نین، بگرە کافر و گومڕان و سەردەمی جاهیلیەتێکی تر دەژین. ئەم ئایدیۆلۆجیای تەکفیرکردنەیە کە دەبێتە مایەی دەرگاکردنەوە بەڕووی توندوتیژیدا، بەتایبەت ئەو کاتەی لە زینداندا دەگات بە"سەید قوتب"و لە (معالم في الطريق)یشدا، دەبێتە گوتارێکی کۆنکرێتی و نەخشەڕێگای ئەو بزاوتە جیهادییانەی گەنجەکان زۆرینەیان پێک دەهێنن.

"سـەید" شـان بەشـانی "مـەودوودی" پێی وایە، مـرۆڤـایەتی لەمـڕۆدا جاهیلییەتێکی تازە دەژی، چوون ئەو جاهیلییەتەی کە بەر لە هاتنی ئیسلام لە ئارادا بوو. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە تەواوی مرۆڤایەتی لە هەقیقەت و جەوهەری عەقیدەی ئیسلامی بێئاگان و نۆرم و بەها و مۆراڵی ئیسلامیان بیر چووەتەوە. لە غیابی حاکمیەتی یەزدان و شەریعەت و بەرنامەی خوادا، ئەوەی حوکم دەکات نۆرم و بەهای ئەو شارستانییەتە ماددییەی خۆرئاوایە کە نەک هەر مـرۆڤی لە خـوا و لە ئاین دوور خـسـتـووەتەوە، بگرە لە مرۆڤبوونیشی خستووە.

ئەگەر "مـەودوودی" سیـفەتی موسـڵمانبوون لە زۆربەی زۆری خـەڵکانی وڵاتانی ئیسلامی بسەنێتەوە و گومان لە راستگۆیی موسڵمانبوونیان بکات، ئەوا "سەید قوتب" لە مامۆستاکەی تێ دەپەڕێنێت و پڕکێشی زیاتر دەکات و هەموویان بەبێ جیاوازی تەکفیر دەکات. ئەوەتا بەڕوون و رەوانی دەڵێت: (خەڵک و خوا وەکو خۆیان پێیان وایە موسڵمان نین و ژیانی جاهیلییەت دەژین. نە ئەمە ئیسلامە و نە ئەوانیش موسڵمانن.. خەڵکانی ئەمڕۆ لە ئاین هەڵگەڕاونەتەوە و گومڕا بوون... حەرامخۆری و سنووربەزاندن باوەو کوفر حوکم دەکات... مرۆڤایەتی نوقمی ناو جاهیلییەتێکە، بەدتر و تاریکتر لە جاهیلییەتی سەرەتا...).

"سەید " و "مەودوودی" پێکەوە، وێنەی دنیایەکی تاریک و نووتەک دەکێشن و راست و چەپێک بەسەر مێژوویەکی دوور و درێژی مرۆڤایەتیدا دێنن. لەناو عەدەمیەتی ئەم تاریکستان و ئەم جەنگەڵەی ئەوان وێنای دەکەن، "سەید" دێت و دەپرسێت کەواتە چی بکەین و چۆنچۆنی دەست بەپرۆسەی ژیاندنەوە و رابوونی ئیسلامی بکەین؟

لەوەڵامـدا بەپیـتی درشت دەنووسـێت: (لەبەرئەوەی بزاوتی ئیسـلامی ئەمڕۆکە لە دۆخێکدایە، تەواو بەو دۆخە دەچێت کە مرۆڤایەتی تێدا بوو،

کاتێک بۆ یەکەم جار پەیامی ئیسلامی پێ گەیشت، ئەوا پێویستە مرۆڤی موسڵمان لەپێناو راگەیاندنی بزاوتێکی ئیسلامی و رێکخستنێکی کارادا، سەری خۆی ببەخشێت).

واتە "سەید" هەر لە سەرەتاوە، دنیامان وەک گۆڕەپانی شەڕێکی نەبڕاوە بۆ وێنا دەکات.. دوژمن و ناحەزانێکی زۆر لەسەر گۆڕەپانەکەن و رێگرن لەوەی پەیامەکەی خوا بگاتە جێ. بۆیە دەبێت موسڵمانی راستەقینە، بەگیان بەخشین و قوربانیدان دەست پێ بکات. لێرەوە بەناوی دینەوە مرۆڤگەلێک تەیار دەکرێن، بۆ مردن و بۆ پەلاماردانی هەموو ئەو شتانەی بەکۆسپ دەبینرێن لەو رێگایەدا.

ئێمە زیاتر لە (مەشخەڵی رێ)دا، بە رۆڵ و ئەرکی ئەو گرووپە ئیسلامییە ئاشنا دەبین کە"سەید" لە داهاتوودا چاوەڕوانی گۆڕانکاری زۆری لێ دەکات. لەوێدا چوارچێوەی تیۆری و ئایدیۆلۆجی بەردەست دەخات، بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی ئەو جاهیلییەتە نوێیەی بە (جاهیلیەتی سەدەی بیستەم) ناودێری دەکات و باس لەوە دەکات کە (کۆمەڵگە و دەوڵەت لە کوفر و بێ باوەڕییەکی زەق و زۆپدا دەژین و دۆخی جاهیلییەت دەگوزەرێنن، بۆیە جیهادکردن دەبێتە ئەرکێکی پێویست و هەنووکەیی.. جیهادیش لەوەها حاڵەتێکدا وەزیفەی بەرخود و بەرگریکردن نییە، بگرە دەبێت رۆڵی هێرشبردنی هەبێت و پەلامار بدات، بۆ خاتری رامالینی هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرانەی دێنە بەردەم بانگخوازانی هەق و هەروەها تارومارکردنی هەموو ئەو هێز و دەسەڵاتانەی، دەستدرێژیان کردووەتە سەر حاکمیەتی یەزدان).

کەواتە بەم پێیە بێت توندوتیژی لای "سەید قوتب" نەک رەوایە، بگرە پێویستە بۆ بەدیهێنانی ئەوەی مەبەستە. سەروەختێکیش "سەید قوتب" دەچێتەوە سەر قورئان و سوننە و مێژووی ئیسلام، بەو مەبەستە ئەو کارە

دەکات کە خزمەت بە مەبەستە ئایدیۆلۆجییەکانی بکەن، واتە مامەڵەیەکی تەواوی پراگماتییانە لەگەڵ قورئان و سوننە و مێژوودا دەکات، دواتریش ئەمە دەبێتە نەریتێک لای تەواوی بزاوتە ئیسلامییە توندڕۆکان.

"سەید" پێی وایە، ئەو خاک و زەمینەی ملکەچی حاکمیەتی خوا نەبێت و بەرنامە و شەریعەتی ئەوی تێدا باڵادەست نەبێت، سەرزەمینی کوفر و شەڕە، ئیتر ئاین و بیروباوەڕی ئەوانەی لەوێدا دەژین هەرچییەک بێت. واتە ئەو کۆمەڵگەی موسڵمان بەوە نازانێت کە لە خەڵکانێکی موسڵمان پێکهاتبێت، بگرە بەوەیە تاچەند ملکەچی حوکم و شەریعەتی خوان. بەکورتییەکەی بەلای ئەوەوە جێبەجێکردن و پەیڕەوکردنی شەریعەت و بەرنامەی خوا، تاکە پێوەرێکە کە کۆمەڵگەیەک دەکاتە کۆمەڵگەیەکی موسڵمان و ئیسلامی.

## تەکفیر و توندوتیژی لە "سەید قوتب"ەوە بۆ قاعیدە

فۆرمەلاکردنی ئایدیۆلۆجیای تەکفیر لەسەر دەستی "سەید قوتب"، بوو بە ئەنگیزەیەک بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان و دواتریش لە تەواوی ناوچە جیاجیاکانی دنیادا. ئەڵبەت کە "سەید" لەسێدارە دەدرێت و لای زۆربەی زۆری ئیسلامییەکان دەبێتە شەهیدێک کە لەپێناو ئایدیایەکدا سەری ناوەتەوە، ئەوەندەی تر بیرو بۆچوونەکانی کاریگەرتر دەبن و سنوورەکانی وڵاتی میسر دەبڕن و کاریگەری لەسەر یەک بەیەکی بزاوتە ئیسلامییە جیهادییەکان جێدێڵن.

لەژێر کاریگەری "مەودوودی" و"سەید"دایە، "سەعید حەوا" وەک یەکێک لە سەرکردە دیارەکانی ئیخوان موسلمین لە سووریا، داوا دەکات سەرلەنوێ ئیخوان خۆی رێک بخاتەوە و لە هێزێکی بانگخوازی مەدەنییەوە، بگۆڕێت بۆ حیزبێکی رادیکاڵی جیهادی بەناوی حیزبوڵلاوە. لە لوبنانیش بەهەمان

شێوە "فەتحی یەکن"، بەشوێن پێهەڵگرتنی (معالم) و (في الظلال)، داوا دەکات موجاهیدانی ئیسلام، دنیا بەزیندانی مرۆڤی ئیماندار و بەهەشتی کافران بزانن و وەها خۆیان پەروەردە بکەن بە رادەی خۆشەویستی بێباوەڕان بۆ ژیان، مردنیان خۆش بوێت و تەمەننای بکەن.

بێگومان پەروەردەیەکی لەم جۆرە، دەبێتە مایەی دروستکردنی کارەکتەرێکی شەڕانگێز و توندڕۆ کە کۆمەڵگە بەدوژمنی خۆی دەزانێت و وەک سەرزەمینی کوفر و جەهالەت لێی دەڕوانێ. لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا لەژێر کاریگەری بۆچوونەکانی "سەید قوتب دا، گرووپگەلێکی ئیسلامی دەبینین بەناوی (تەکفیر و هیجرە) وە کە لەگەڵ دەسەلات و کۆمەڵگەدا دەکەونە شەڕێکی بێ ئامانەوە، هەر لە "شوکری موستەفا"وە بۆ" عەبدول سەلام فەرەج"و "عەتا تایل" و "خالید ئیسلامبولی"، تا دەگاتە تالیبان و قاعیدە و گرووپە توندڕۆکانی تری دنیا.

هەوڵی لێبڕاوانەی تەواوی ئەم گرووپانە بۆ ئەوەیە، مرۆڤایەتی لە زەڵکاوی جاهیلییەتی تازە بێننە دەرێ و جارێکی تر ئیسلامیان پێ ئاشنا بکەنەوە، چونکە ئەمانیش لەژێر کاریگەری ئەو بۆچوونەی "سەید قوتب"دا پێیان وایە: (لەمڕۆدا نە ئیسلام بوونی هەیە و نە موسڵمان، هەرچەندە زۆرێک پێیان خۆشە ببنە موسڵمان و پێیان بڵێن موسڵمان، بەڵام دەبێت ئەو هەقیقەتە تاڵە بدەین بە روویاندا کە ئەوان موسڵمان نین، بگرە کافر و گومڕاو بتپەرستن و پێویستە سەرلەنوێ و لەسەر بنەمایەکی تازە، باوەڕ بە پەیامەکەی محەمەد نوێ بکەنەوە و بێنەوە ژێر چەتری ئیسلام).

ئەو توندوتیژی و تیرۆر و کوشت و برە بێئامانەی لە نیو سەدەی رابردوودا دەیبینین، بەرهەمی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەیە کە جیهان بە کوفرستانێکی گەورە دەبینێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەکرێت بڵێین ئەو رەخنە زۆر توند و زبرانەی هەر لە زووەوە "سەید قوتب" ئاراستەی ئەمەریکا

و شارستانییەتی خۆرئاوای کرد، سەرەتای دەسپێکردنی دوژمنایەتییەکی توند بوو لە نێوان ئیسلامیستەکان و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا. بێ ئەوەی ئیسلامییەکان دوای ئەو هەموو ساڵە لە مردنی "سەید قوتب"، هەوڵی ئەوە بدەن بۆچوونەکانیان لەسەر ئەو ولاتە بگۆڕن و بەو چاوە سەیری بکەن کە کۆمەڵگەیەکی فرە کولتوور و فرە ئاینی و فرە ئەتنیکە، واتە کۆمەڵگەیەکی کراوەیە (بە وتەی کارل پۆپەر)، نەک هەر بەدیدگا قیقهییە تەقلیدییەکە لێی بڕوانن وەک سەرزەمینی کوفر. ئەو دیدگایەی لە ئێستادا لە گوتاری رێکخراوی قاعیدەدا بەدی دەکەین و کاریشی پێ دەکات، وەک ئەوەی لە هێرش و پەلامارەکانی سەر مانهاتن و واشنتۆن و پەنسلڤانیادا بینیمان لە یازدەی سێپتەمبەری ساڵی ۲۰۰۱دا.

ئەم ئایدیۆلۆجیا ترسناک و پڕ توندوتیژییەی تەکفیرکردنی دنیا کە بە "مەودوودی" دەستی پێ کرد و دواتر "سەید قوتب" چوارچێوەیەکی کۆنکرێتی پێ بەخشی، ماڵوێرانی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا.. هەندێک لەوانەی لەسەر ئیسلامی سیاسی و ناوەندی ئیسلامی ماڵن، هەر زوو درکیان بە مەترسیی ئەم جۆرە گوتارە کردو لە هەوڵی بەرپێ گرتنیدا بوون. نموونەکانیان وەک "حەسەن هوزەیبی" لە کتێبی (دعاة لاقضاة) کە تەرخانە بۆ بەرپەرچدانەوەی "مەودوودی" و ئەوانەی شوێن پێی ئەویان هەڵگرتووە، لەگەڵ "یوسف قەرزاوی" و "شێخ محەمەد عەبدوللەتیف سەبەکی"، سەرۆکی پێشووتری لێژنەی فەتوا لە ئەزهەر.

تا ئێستاش زۆرێکی زۆر لە ئیسلامییەکان بەمیانڕەو و توندڕەویانەوە، کە باس دێتە سەر بەرپرسیارکردنی "ئەبو ئەعلای مەودوودی" و "سەید قوتب" لە ئاست توندوتیژی و پەرگیری گرووپە جیهادییە رادیکاڵەکاندا، جاڕس دەبن و هەوڵێکی زۆر بەخەرج دەدەن بۆ ئەوەی بەرگری لەو دوو کەسە بکەن و تۆمەتی تەکفیرکردنی کۆمەڵگە و دەوڵەتیان لە کۆڵ بکەنەوە. ئەمەش بۆ

خـــۆی کـــارێکی قـــورس و زەحـــمـــەت و نەکـــردەیە، لەبەرئەوەی دەقـی نووسینەکانیان زۆر بە ڕوون و ڕەوانی باس لەوە دەکەن و نایشارنەوە.

بێـبـەریکردنی "مـەودوودی" و "سـەید قـوتب"و دەقـەکـانـیـان لە ڕەفـتـار و کردەوەی ئیسـلامیسـتـەکان، ڕێک و ڕاست بەو هەولانە دەچێت کە زۆرێک لە مـارکسیستە دۆگمـاتیستـەکان دەیدەن، بۆ ئەوەی "مـارکس" و دەقەکانی لە ڕەفتـار و کار و کردەوەی هێـزە مـارکسی و حزبە کۆمـۆنیسـتـەکان جـیـا بکەنەوە. کاری ئەو دوو لایەنـەش (چ مارکسـیـیـەکان و چ ئیسـلامـیـیـەکان)، هەوڵێکی بێهوودەیە.



# یازدەی سێپتەمبەر و ئیسلامییەکانی کوردستان

"جوولەکە و کافر خۆیان ناتەقێننەوە، ئەوەی موسڵمان نەبێت ئەوەی لە دەست نایەت. دەبێت بەهەشتت چاک لێ دیار بێت، ئەوجا دەتوانیت خۆت بکەیتە قومبەلە... ئەوە لەبەر زێدە دیموکراسییان نییە، لەبەر ترسنۆکییانە. لەبەر ئەوەیە باوەشیان بەژیانی دنیادا کردووە، ئەوە موسڵمان نەبێ کەس ئەوەی لە دەست نایەت".

عەلی باپیر

## هەڵوێستی ئیسلامییەکانی کوردستان
## لە ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر

لەم نووسینەدا هەوڵ دەدەم لەسەر دوو تەوەر قسە بکەم، یەکێکیان هەڵوێستی هێزە ئیسلامییەکانی کوردستانە لە ئاست هێرش و پەلامارەکانی قاعیدە لە یازدەی سێپتەمبەردا بۆ سەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەوی تریان هەلومەرج و ستراتیجی کارکردنی ئیسلامی سیاسییە لە کوردستاندا، دوای ئەو ڕووداوە و دوای پرۆسەی ئازادکردنی عێراق و کۆتاییهاتنی حوکمڕانی بەعس.

پڕ ئاشکرایە ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر و پەرچەکرداری ئەمەریکا و ڕۆژئاوا، لە بەرانبەر قاعیدە و ئیسلامییە رادیکاڵەکانی دنیادا، دوو دەستکەوت و دوو بەرهەنجامی گرینگی بۆ ئەم هەرێمەی ئێمە تێدا بوو. یەکێکیان ژێرە و ژوورکردنی دەسەڵاتەکەی "سەدام حسێن" و کۆتاییهێنان بوو بە ستراتیجی کوردقڕان و جینۆسایدکردنی میللەتی ئێمە بەیەکجاری، ئەوی تریشیان تارومارکردنی ئەو هێزە ئیسلامییە پەرگیرە بوو کە ئەندامانی جوندلشام (باڵی رائید خرمیسات) و گەنجانی کەتیبەی دووی سۆرانی ناو بزووتنەوەی ئیسلامی، بەناوی (جوندلئیسلام لە کوردستان) دا دروستیان کرد و لە بەرواری ٢٠٠١/٩/١ خۆیان ئیعلان کرد.

کاردانەوەکانی ئەمەریکا و ڕۆژئاوا دوای یازدەی سێپتەمبەر نەبوایە، ئەم هەرێمەی ئێمە مەحکووم بوو بەوەی لە نێوان بەرداشی هەڕەشە و مەترسی، دەسەڵاتی "سەدام حسێن" لە بەغدا و هۆردووی موجاهیدەکانی (جوند و ئەنسار) لە ناوچەکانی هەوراماندا بیگوزەراندایە. بەکورتییەکەی ئەگەر

ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر بۆ هەندێ (بەڵا) بووبێت، ئەوا بۆ هەرێمی کوردستان (خەڵاتێک) بوو کە تارمایی دوو هێزی ترسناک و شەڕانگێزی لە کۆڵ کردینەوە.

ئەوەی لەم بەشەی ئەم نووسینەدا دەمەوێت لەسەری بووەستم، نیشاندانی هەڵوێستی ئیسلامییەکانی کوردستانە لە ئاست هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەردا. بێگومان دە ساڵ تێپەڕبوون بەسەر ڕووداوەکەدا، مێژوویەکی باشە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بەوردی هەڵوێستی هێزە ئیسلامییەکانی کوردستانی تێدا دیاری بکات و را و سەرنجی ئەوانی تێدا بزانێت. بەو پێیەی لە دە ساڵی رابردووشدا هەریەک لە کۆمەڵ و یەکگرتوو، دوو دیارترین و گەورەترین هێزی ئیسلامی سەر ساحەی کوردستان بوون، ئەوا زیاتر قسە و هەڵوێستی ئەوان دەکەین بەپێوەر و لەلای ئەوان دەوەستین.

تەواوی هێزە ئیسلامییەکانی دنیا (سەرەڕای جیاوازی زۆری نێوانیشیان)، بەڵام لە هەندێ پرس و مەسەلەدا یەک دەنگ و یەک هەڵوێستن، گرینگترین ئەو مەسەلانەش (کێشەی فەڵەستین و دژایەتیکردنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و شارستانییەتی ڕۆژئاوا و دەوڵەتی ئیسرائیله). بەو پێیەشی هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠١ بۆ سەر پەنتاگۆن و مانهاتن بوون، وەک دوو سمبولی سەربازی و ئابووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەوا تەواوی هێزە ئیسلامییەکانی دنیا بەو کردەوانە خۆشحاڵ بوون و سەبووریيان هات و زۆربەی زۆریشیان بەئاشکرا زەماوەندیان گێڕا. ئەمەش بۆ خۆی تاوانێکی تر بوو، چونکە وەک شاعیری گەورە و دیاری عەرەب "ئەدۆنیس" دەڵێت: (خۆشحاڵبوون بە تاوانێک، تاوانێکی ترە).

بەهەرحاڵ لەسەر ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر لەلایەن هێزە

ئیسلامییەکانی دنیاوە (بەئاشکرا و ژێربەژێر) ئیجماعێک هەبوو، ئیسلامییەکانی کوردستانیش لە دەرەوەی ئەو ئیجماعەدا نەبوون. وەک بەڵگەیەک و دەرهەق بەو مەسەلەیە، ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی قسەیەکی هەیە دەڵێت: (ئیسلامییەکانی کوردستان و هی هەموو دنیاش، پێویستە یەک دەنگ و یەک هەڵوێست بن، لەسەر ئەو شتانەی بەڵگەی شەرعییان لە سەرە و بەهەق و رەوای دەزانن). بڕوانە: (عەلی باپیر: ڕۆژنامەی هاوڵاتی، ژمارە -٤٦ بەرواری یەکشەمە ٢٨/١٠/٢٠٠١).

قسە و لێدوان و هەڵوێست و نووسینی کاربەدەست و کادیر و هەڵسووڕاوانی کۆمەڵ و یەکگرتوو، نیشاندەری ئەوەن کە ئەوانیش وەک تێکڕای ئیسلامییەکانی دنیا، ئەگەر ڕێک و ڕاستیش لەگەڵ هێرش و پەلامارەکانی موجاهیدەکانی قاعیدەدا نەبووبن، ئەوا بەهیچ کلۆجێک ئیدانەی ناکەن و لە دژی ناوەستنەوە. لێرەدا بۆ ئەوەی هەر قسەی رووت نەکەین و حوکم نەدەین، بە بەڵگەوە هەندێ نموونە بەرچاو دەخەین کە کەم تا زۆر هەڵوێستی یەکگرتوو و کۆمەڵمان نیشان دەدەن، وەک دوو هێزی دیار و کارای سەر ساحەی سیاسی لە هەرێمی کوردستان.

## یەکگرتووی ئیسلامی و پاکانەکردن بۆ قاعیدە

ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا ئەگەر دەقاودەقیش کۆپی ئیسلامی سیاسیی عەرەبی نەبێت، ئەوا کاریگەری زۆر و زەوەندی ئەوانیان لە سەرە و لە زۆر مەسەلەدا دەکرێت وەک درێژکراوەی ئەوان سەیریان بکەین. گوتار و دنیابینی و بەرنامەی کارکردنی هێزە ئیسلامییەکانی ئێمە، زۆر بەتۆخی تارماییی هێزە ئیسلامییە عەرەبییەکانی لەسەر دیارە. لە یەکگرتووەوە بیگرە وەک باڵی ئیخوان موسلمینی ناو کوردستان، تا دەگاتە سەر کۆمەڵ و بزووتنەوە و نەهزە و جوند و ئەنسار ئیسلامی جاران.

یەکگرتوو لەژێر ئەم کاریگەرییەتییەدا و لە ڕێی سەرۆکی ئەنجوومەنی

سەرکردایەتی حزبەکەیانەوە (عەرەب و ئیسلامی سیاسیی عەرەبی دەکات بە قیاس و شاهیدێک)، لەسەر ئەوەی کە کارە تیرۆریستییەکانی یازدەی سێپتەمبەر زایۆنیزمی جیهانی ئەنجامی داوە، نەک "محەمەد عەتا" و "رەمزی بن شیبە" و مەروان شێحە". سالێکی رەبەق دوای رووداوەکە و لە شەوی ١٠ -٢٠٠٢/٩/١١ دا، "محەمەد رەئووف" سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی یەککگرتوو لە بەرنامەی گفتوگۆی سێشەمدا دەڵێت: (ئەمە کاری گرووپێکی بچووکی وەک قاعیدە نییە و ئەو عەرەبانەشی قسە لەسەر ئەم رووداوە دەکەن، بەدەستی حەرەکەی سەهیۆنی دەزانن). لەلایەکی ترەوە یەککگرتوو لە رێی وتەی سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتییەکەیەوە، نەک هەر هەڵوێستی دژ بەرامبەر کردەوە تیرۆریستییەکانی یازدەی سێپتەمبەر وەرناگرێت، بگرە لە هەوڵی پاکانەکردنێکی زەق و زۆپدایە و ئەم قسانەی "محەمەد رەئووف"یش بەڵگەی زیندوون: (مەسەلەکە هێندە گەورەیە، لە سەروو توانای بن لادن و چەند نەفەرێکەوەیە. ئەگەر بن لادن بەدەنگ و رەنگی خۆشی تەئکیدی لەوە کردبێتەوە کە خۆی ئەو کارەی ئەنجام داوە، ئەوە هەمووی فەنی ئیعلامییە و دەکرێت تەرتیب بکرێت، لە رێی فنوونی تەکنۆلۆجیای ئیعلامییەوە کە هەیە). هەر لە درێژەی ئەو پاکانە بۆ کردنانەی سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی یەککگرتوودا، دووپاتی دەکاتەوە کە: (بەڕاستی ئێمە تائێستاش تەسەورمان بۆ دروست نابێت، قاعیدە بەو بچووکییەوە بتوانێت ئیشی وا گەورە بکات).

ئەمە هەڵوێستی یەککگرتووە لە دوای سالێک لە هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەر، بۆ سەر وڵاتە یەککگرتووەکان و پاکانەکردنەکەشی لە کاتێکدایە کە قاعیدە، بەدەنگ و رەنگ و بەزمانی خۆیان ئیعلانی دەکەن کە ئەو هەڵمەتە موقەدەسە بەرهەمی رەنج و کۆششی ئەوانە و جیهادی ئەوانە لە دژی زلهێزێکی وەک ئەمەریکا.

## کۆمەڵ و هاوهەڵوێستی

وەک هەر هێزێکی ئیسلامی سیاسی، کۆمەڵیش ئیدانەی ئەو کردەوانەی ڕێکخراوی قاعیدە ناکات و هاوسۆزە لەگەڵ موجاهیدەکانیدا. ئەگەر یەکگرتوو لە ڕێی پاکانەکردنەوە بۆ قاعیدە، هاوسۆزی خۆی نیشان دابێت، ئەوا کۆمەڵی ئیسلامی لە ڕێی پێداگیرکردنی بێ پێچ و پەناوە ئەوەی کردووە. قسە و لێدوانەکانی ئەمیری کۆمەڵ، بەڕوون و ڕەوانی هەڵوێستی کۆمەڵ لە ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر و دواتری ڕێکخراوی قاعیدە ئاشکرا دەکەن.

لە گفتوگۆیەکی درێژی ڕۆژنامەی (میدیا)دا کە لە ژمارە (٢١٧)ی بەرواری ٢٠٠٥/١/٢٢ دا بڵاو کراوەتەوە، "عەلی باپیر" دەڵێت: (من ئێستاش دەڵێم، بەرهەڵستیکردنی ئەمەریکا کارێکی ڕەوایە) و بەئاشکراش ڕای دەگەیەنێت کە (ئەسڵەن خۆ تەقاندنەوەی پێی تیرۆر نییە). لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەی شەوی ٢٠٠٥/١١/١٥ دا دەڵێت: (ئێمە کوشتنی خەڵک و ڕەشەکوژی بە تیرۆر تێناگەین).

ئەگەر یەکگرتوو لە ڕێی "محەمەد ڕەئووف"ی سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتییانەوە، هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەر بەدەستی حەرەکەی سەهیۆنی بزانن و جوولەکە و کافری پێ تاوانبار بکەن و ئەستۆپاکی قاعیدە لەو تاوانە رابگەیەنن، ئەوا "عەلی باپیر" بەپێچەوانەوە و زۆر ڕاشکاوانە دەڵێت: (جوولەکە و کافر خۆیان ناتەقێننەوە، ئەوەی موسڵمان نەبێت ئەوەی لە دەست نایەت. دەبێت بەهەشتت چاک لێ دیار بێت، ئەو جا دەتوانیت خۆت بکەیتە قومبەلە. ئەوە لەبەر زێدە دیموکراسییان نییە، لەبەر ترسنۆکییانە و لەبەر ئەوەیە باوەڕیان بەژیانی دنیادا کردووە. ئەوە موسڵمان نەبێت، کەس ئەوەی لەدەست نایەت). بڕوانە: (عەلی باپیر: هەفتانەی میدیا، ژمارە ٢١٧ بەرواری ٢٠٠٥/١١/٢٢).

لای یەکگرتوو ئەوەی کارەکەی کردووە قاعیدە نییە و کەسانی ترن، ئەوە زایۆنیزمە چەپەڵەکانن ئەو کارانە دەکەن و قاعیدەیەکی گچکە، لەعەوەی کارێکی وا قورس و زەحمەت نایەت. بەڵام کۆمەڵ ئەو کارە بە بەرهەمی باسک و بازووی موسڵمانانی موجاهید دەزانێ و نەک وەک کردەوەی تیرۆریستی نایناسێنێ، بگرە بە کارێکی تەواو رەواشی دەبینن (من ئێستاش دەڵێم، بەرهەڵستیکردنی ئەمەریکا کارێکی رەوایە).

لەو پەرەگرافەدا ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی، خۆتەقاندنەوە دەکاتە تایبەتمەندییەکی کارەکتەری موسڵمان و خاسیەتێکی ئیسلامی و جوولەکە و کافرانی لێ بەری دەکات.. ئەو دێت لێرەدا موسڵمانان وەک مەعشەرێکی مەرگدۆست و تەرێزکردوو لە ژیان نیشان دەدات، جوولەکە و کافرانیش (کە مەبەست لێیان ئەمەریکایی و ڕۆئاواییەکانن)، وەک کەسانی ژیاندۆست و پەرۆشی زیندەگی وێنا دەکات.

موسڵمانان وەختێ بەهەشت بەچاکی دەبینن، رق لە ژیان هەڵدەگرن و دەبنە دینامێت و تی ئێن تی و ژیان و بوونەوەرەکانی خوا لەسەر زەوی تارومار دەکەن و دۆزەخ دەخوڵقێنن، بەڵام جوولەکە و ڕۆئاواییە ترسنۆکەکان لەبەرئەوەی چاویان بەچاکی بەهەشت نابینێ، تەرێز لە مەرگ دەکەن و لەوە دەترسێن ببنە بۆمبی تەوقیتکراو و باوەش بەژیاندا دەکەن و ئاوێزانی زیندەگی دەبن.

لە هەڵوێستی کۆمەڵ و یەکگرتوودا دەرهەق بەهێرش و پەلامارەکانی سەر نیویۆرک و واشنتۆن، (قاعیدە بووبێت یان نا)، گرینگ ئەوەیە هیچیان ناچنە ژێرباری سەرکۆنەکردنی کردەوە تیرۆریستییەکە و هەریەکە و بەجۆرێک، پاساوی بۆ دێننەوە و قاعیدەی بێگوناه لێ دەردەکەن. بێگومان ئەمەش هەر بەتەنیا هەڵوێستی کۆمەڵ و یەکگرتوو نییە، بگرە هەڵوێستی تێکڕایی ئەو گرووپ و رێکخراوانەیە لە جیهاندا کە لەژێر چەتری ئیسلامی سیاسیدا کۆ دەبنەوە.

## ئیسلامییەکان گێڕیان گۆڕی

ڕۆژی سێشەم بەرواری ٦/٧/٢٠١٠و لە ژمارە (٢٣١)ی هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا، "دڵشاد گەرمیانی" ئەندامی مەکتەبی سیاسی کۆمەڵی ئیسلامی - ئێران، وتارێکی لەژێر سەردێری (بیروباوەڕ و بەرژەوەندی لە شەڕێکی نابەرانبەردا) بڵاو کردووەتەوە و تێیدا ترسی خۆی لە گێرگۆڕینی ئیسلامییەکانی کوردستان نیشان دەدات (ئەڵبەت لەناو هەموشیاندا بەتایبەتی، مەبەستی هێز و ڕێکخراوەکەی خۆیەتی کە کۆمەڵی ئیسلامییە).

"دڵشاد گەرمیانی" لەو وتارەیدا، بەم شێوەیە شەرحی واقیعی حاڵی ئێستای ئیسلامییەکانی کوردستان دەکات و دەڵێت: (پاش چەند ساڵێکی تر، دەبینە تەیرێکی سەیر و سەرسوڕهێنەر. نە لە ریزی ئیسلامی پۆلێن دەکرێین، نە عەلمانیش دەمانگرێتە خۆی. سەر لە خۆمان و خەڵکیش دەشێوێنین، ئەو کاتەش نابێت ناهەقی ئەو کەسانە بگرین کە گاڵتەمان پێ دەکەن، یان بە گوتەی خەڵکی سلێمانی پێمان دەڵێن: ئیسلامییەکان گێڕیان گۆڕی).

ئەم پەرەگرافە لەم وتارەی "دڵشاد گەرمیانی"دا ناچارمان دەکات بەوەی بپرسین: (ئەرێ بەڕاست ئیسلامییەکانی کوردستان گۆڕان یان بەقەولی دڵشاد گەرمیانی گێڕیان گۆڕی، یاخۆ ئەوە زەبری ئەمەریکا و گۆڕانکارییەکانی دنیای دوای یازدەی سێپتەمبەر و پرۆسەی ئازادکردنی عێراق و ئەفغانستان و تارومارکردنی ڕێکخراوی قاعیدە بوو، هەندێ لە ئیسلامییەکانی کوردستانی ناچار بە گۆڕان کردو، هەندێکی تریشیانی لەسەر ساحەی هەرێمی کوردستان پایەماڵ کرد؟).

بێگومان لە هەرێمی کوردستاندا بەرەنجامێکی گرینگی جەنگی دژە تیرۆر و پرۆسەی ئازادکردنی عێراق، لەناوبردنی ڕێژیمە دیکتاتۆرییەکەی بەعس بوو، لەگەڵ پاککردنەوەی ناوچەکانی هەورامان لە گرووپی ئەنسار ئیسلام و

پاشانیش گۆڕینی ستراتیجی کار و بەرنامەی هێزێکی وەک کۆمەڵی ئیسلامی بوو.

لەگەڵ راپەڕینی خەڵکی کوردستان لە بەهاری ١٩٩١دا، ئیسلامی سیاسی دەبێتە بەشێک لە واقیعی سیاسی هەرێم و لە ڕووی جەماوەرییەوە دەبنە هێزی سێیەمی کوردستان. سەرباری ئەو لەشکرە زۆرەی بزووتنەوەی ئیسلامی و ئەو جبەخانە گەورە و ئەو رووبەرە جوگرافییە بەرفراوانەی لەبن دەستیاندا دەبێت، بەڵام تا بەراییەکانی سەدەی بیست و یەک و تاخۆ ئیعلانکردنی (جوندلئیسلام) لە ٢٠٠١/٩/١دا، ئیسلامی سیاسی بەو فۆرمە شەڕانگێز و پەرگیرییەوە خۆی نانوێنێت.

بە هاتنی (جوندلئیسلام)، تەحەولێکی گەورە و چاوەڕواننەکراو بەسەر کارکردنی ئیسلامی سیاسیدا دێت لە کوردستان. "خرەیسات و زەرقاوی و ئەبوعەبدوڵای شافعی"، نموونەیەکی تری ئیسلامی سیاسی نیشانی کۆمەڵگەی کوردی و هێز و لایەنە عەلمانی و ئیسلامییەکانی تر دەدەن.

بێگومان مانەوەی ئەو یەک دوو ساڵە کەمەی ئەم هێزە لە ناوچەکانی هەوراماندا، بەئاشکرا دەری خست گەر زەبر و هێزی ئەمەریکاییەکان نەبووایە، زەحمەت بوو هێزە کوردییەکانی وەک پارتی و یەکێتی بیانتوانیایە، بەر بە هەڕەشە و مەترسی ئەو گرووپانە بگرن و چالاکییەکانیان سنووردار بکەن. لێرەوە کاتێک ئەمەریکاییەکان لە چوارچێوەی شەڕی دژە تیرۆر و پرۆسەی ئازادکردنی عێراقدا، دێن و ئەو ناوچانە لەم هێزە رادیکاڵە ئیسلامییە پاک دەکەنەوە، بەتەنیا نابنە مایەی هەڵکەندنی (جوند و ئەنسارولئیسلام) لە ناوچەکەدا، بگرە لەگەڵیشدا هەلومەرجێکی سیاسی تازەی واش دێننە گۆڕێ کە هێزە ئیسلامییە سیاسییەکانی تری کوردستان، شێلگیرانەتر کاری سیاسی بکەن و لە زۆر رووەوە خۆیان بگۆڕن.

من بۆ خـۆم له وتارێکی چەند ساڵی پێـشوومـدا له ڕۆژنامـەی (ئاوێنه)دا بەناوی (ئیسلامی سیاسی و گۆڕان کۆمەڵی ئیسلامی وەک نموونه)، کەم تاکورتێک باسی گۆڕانی هێزه ئیسلامییەکانم کردووه و وەک نموونەیەکی بەرجەستەش لەسەر کۆمەڵی ئیسلامی وەستاوم، له دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوه. باسم لەوه کردووه که گۆڕانی خۆبەخۆ له هەناوی گرووپگەلی ئیسلامی سیاسیدا، کارێکی زەحمەت و نەکردەیه. ئەو هێزانەی دەگۆڕێن و ستراتیجی کاری خۆیان دەگۆڕن، ناچار دەکرێن و جەبری مێژوو وایان لێ دەکات گۆڕانکاری بکەن، نەک قەناعەتی ناوەکی خۆیان.

له هەرێمی کوردستانیش ئەوەی وای کرد کۆمەڵ ببێت به یەکگرتوو نەک ئەنسار ئیسلام، هاتنی ئەمەریکا بوو بۆ ناوچەکە. بەرهەمی ئەو هەلومەرجه تازەیه بوو که له ئاکامی پرۆسەی ئازادیی عێراق و جەنگی دژەتیرۆردا دروست بوو. واته بەرەنجامێکی گرینگی دوای یازدەی سێپتەمبەر له کوردستاندا، هەم ڕووخاندنی ڕێژیمی بەعسه و هەم کۆتاییهێنانه بەمانەوەی ئەنسارولئیسلام له کوردستان، لەگەڵ گۆڕینی کۆمەڵی ئیسلامی له هێزێکی چەکداری و سەربازییەوه بۆ هێزێکی سیاسی و مەدەنی که بەشداری له پرۆسەی سیاسی وڵاتدا بکات، چ له کوردستان بێت یان بەغدا.

خوێنەر بۆ ئەوەی له هەقیقەتی ئەو وەرچەرخانەی کۆمەڵی ئیسلامی تێ بگات، با بگەڕێتەوه سەر نامەیەک و ڕوونکردنەوەیەکی "دڵشاد گەرمیانی" ئەندامی مەکتەبی سیاسی کۆمەڵی ئیسلامی که له ڕۆژنامەی هاوڵاتی ژماره (١٩٠)ی ڕۆژی چوارشەم ٢٠٠٤/٩/٨و ژماره (٢٦٠)ی چوار شەم ٢٠٠٦/١/٨دا بڵاو کراوەتەوه.

"دڵشاد گەرمیانی" لەو نامه کراوەکەیدا که ئاڕاستەی "عەلی باپیر"ی کردووه، دەڵێت: (برا گەورەکەم، پێشهات و گۆڕانکارییەکانی ناوچەکه پاش لێدان و داگیرکردنی عێراق و ئەو زنجیره زوڵم و ستەمەی که له ماوەی

رابردوودا له كۆمەڵى ئيسلامى كرا، هۆكاريّكى سەرەكى بوو بۆ بەستنى كۆنگره و گۆڕانكاريى له پەيڕەوى ناوەخۆى كۆمەڵى ئيسلامى و شێوازى كار و چۆنييەتى بيركردنەوەى رووداوەكانيش، كاريگەرى زۆريان هەبووە و هەيە لەسەر بيركردنەوەى هەريەك له ئەندامان).

له شوێنێكى تريشدا دەنووسێت: (كۆمەڵ بۆ رازيكردنى ئەمەريكاييەكان، بڕيارى هەڵوەشاندنەوەى مەكتەبى عەسكەرى دا). كەواته وەرگۆڕانى كۆمەڵ له هێزێكى چەكدار و عەسكەرييەوە بۆ هێزێكى سياسى و مەدەنى، گۆڕانكارييه تازەكانى دنيا و سەنگ و قورسايى ئەمەريكا له ناوچەكەدا دروستى دەكات. ئەوە هاتنى ئەمەريكايه وا دەكات، كۆمەڵ دەستبەردارى گوتارى پەرگيرى و چەك و ئارم و دروشم و مەكتەبى عەسكەرى بێت و سەرەڕاى دەستگيركردنى ئەميرەكەشيان لەلايەن هێزەكانى ئەمەريكاوە، شێلگيرانه سەرقاڵى پرۆسەى سياسى عێراق و كوردستان بن و وەك هێزێك بەشدارى پرۆسەى هەڵبژاردنەكان بكەن.

هەرچەنده "عەلى باپير" له رۆژنامەى (هاولاتى) ژمارە (٢٧٨)دا دەڵێت: (هيچ شتێك له ستراتيجى ئێمەدا نەگۆڕاوە، تەنيا خۆمان لەگەڵ زرووفەكەدا گونجاندووە)، يان ئەوەى كە "مەلا كرێكار" له ژمارە (٦٧)ى هەفتەنامەى (ئاوێنەدا) دەڵێت: (باڵى مامۆستا عەلى باپير پێى وايه - قاتلوا واقتلوا - راستره، با ئێستاش بۆى نەكرێت). بەلام ناچاركردنى كۆمەڵ بەدەستبەرداربوون لەو بەرنامەى كار و ستراتيجەى جارانى و تێكەڵكردنى بەپرۆسەى سياسى، رەنگه له داهاتوويەكى نزيكدا شوناسى ئەو هێزه بكاته شوناسێكى مەدەنى سياسى هەميشەيى و واى لێ بكات واز له مەيلى عەسكەرتارييەت و هێزى ميليشيايى بهێنێت.

بەگشتى دواى پرۆسەى ئازادى عێراق و دواى هاتنى هێزەكانى ئەمەريكا بۆ ناوچەكە، زۆرێك له ئيسلامييەكانى كوردستان گۆڕانيان له خۆياندا كرد،

رەنگە (ئەنسارلئیسلام) و "مەلا کرێکار" لەوانەبن کە بە هەمان نەفەسی جاری جاران کار بکەن و بەردەوام بن. (ئەنسارلئیسلام) لەسەر زاری بەرپرسی راگەیاندنی گرووپەکەیان کە "مەلا ئاکام"ە دەڵێت: (بەو خوایەی ئێمەی خەلق کردووە، تا ئیسلام سەرنەکەوێت و ئاڵای ئیسلام بەسەر هەموو ماڵێکی ئەم سەرزەمینەوە نەگەشێتەوە، بەردەوام دەبین لە جیهاد و تا تنۆکی خوێن لەگیانماندا مابێت بۆ جیهادکردن، لە رێی خوادا شەڕ دەکەین). بڕوانە: (هەفتەنامەی ئاوێنە، ژمارە - ٩- سێشەمم ٢٠٠٦/٣/٧). یان ئەوەی "مەلا کرێکار" هەتا ئێستاش سوورە لەسەر ئەوەی بڵێت: (ئوسامە بن لادن تاجی سەری ئوممەی ئیسلامە).

بەهەر حاڵ یازدەی سێپتەمبەر و شەڕی دژە تیرۆر وایان کرد، ئیسلامی سیاسی (بەتایبەت تایپە رادیکاڵی و جیهادییەکەی)، لە کوردستاندا بپووکێتەوە و بکەوێتە پەراوێزەوە، لە بەرانبەریشدا ئەو هێزانە بێنە پێشی کە بڕوایان بەکاری سیاسی و مەدەنی هەیە.

لەم چەند ساڵەی دواییدا هاتنی ئەمەریکا ئیسلامییەکانی کوردستانی ناچار کرد، تێکەڵ بەپرۆسەی سیاسی بن و لە جاران زیاتر مەدەنییانە رەفتار بکەن. هاوکات لە دوو ساڵی رابردووشدا، هاتن و دروستبوونی بزووتنەوەی گۆڕان وای کرد رۆڵی ئۆپۆزسیۆن وازی بکەن.

لە بیست ساڵی دوای راپەڕیندا، ئیسلامییەکانی کوردستان دەستیان دەدایە چەک و شەڕی ناوخۆیان دەقەوماند، یان دەبوونە پاشکۆی یەکێتی و پارتی و لە چاکترین حاڵەتیشدا دەبوونە ئۆپۆزسیۆنێکی شەرمن و بێدەنگ و پاسیڤ. تەنیا لەگەڵ دروستبوونی گۆڕاندایە، زمان دەگرن و دێنە قسە.

ناڵەباری و بێ سەروبەری بارودۆخی کوردستان لەم بیست ساڵەی رابردوودا، چەندەی بەئەستۆی یەکێتی و پارتییە وەک دوو هێزی دەسەڵاتدار، ئەوەندەشی بەئەستۆی ئیسلامییەکانە کە نەیانتوانیوە لە هیچ

قـۆناغێکدا، وەک ئۆپۆزسیـۆنێکی مـەدەنی رەفـتـار بکەن و ئەم وڵاتە لە زۆر کێشە و قەیران دوورخەنەوە.



# فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی وەک پەتایەک

## عەبدولوەهاب موئەدەب و پرسی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی

---

"ئەگەر دەمارگیری دەردی کاتۆلیکییەت بێت، نازیزمیش پەتای ئەڵمانیا بێت، ئەوا بێگومان فێندەمێنتالیزم دەرد و نەخۆشی ئیسلامە".

عەبدولوەهاب موئەدەب

## سەرچاوەی نەهامەتییەکە

هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەر چەند خوێنی رشت، ئەوەندەش مەرەکەبی بەنووسەران رشت و ئەوەندەش لاپەڕەی بە بیریاران و لێکۆڵیاران و رۆشنبیران رەش کردەوە. بەدرێژایی تەمەنی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی کە خۆی لە سەروو هەشت ساڵێک دەدات، هیچ کات هێندەی دوای یازدەی سێپتەمبەری ٢٠٠١ باسوخواسی لە بارەوە نەنووسراوە. لە وڵاتانی ئیسلامییەوە بیگرە تا وڵاتانی ئەورووپی و وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

"عەبدولوەهاب موئەدەب" یەکێکە لەو ئەکادیمیستە تونسییانەی، ساڵانێکی زۆرە لە فەرەنسا دەژی و یەکێکە لەوانەی لە ماوەی ئەم دە ساڵەی دوای پەلامارەکانی قاعیدە بۆ سەر نیویۆرک و واشنتۆن، زیاد لە کتێبێکی لەسەر هۆکار و بەرەنجامەکانی ئەو هێرشانە و لەسەر پرسی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی و ئیسلام وەک ئاینێک نووسیوە.

وەکی "هاشم ساڵح" لە کتێبی (داخرانی مێژوویدا) دەڵێت: (موئەدەب وەکی زۆربەی ئەو رۆشنبیرە عەرەبانەی لە تاراوگە دەژین، دوای هێرش و پەلامارەکانی یازدەی سێپتەمبەر، هەستی بەتووڕەیی و بێزارییەکی زۆر کردووە. هەر لەبەر ئەوە دەستی داوەتە قەڵەمەکەی و دید و بۆچوونی خۆی لەسەر ئەو کارەساتە گەورە بەیان کردووە. موئەدەب وەک عەرەب و موسڵمانێک هەست دەکات ئەو رووداوە، بەر لە هەرکەس بەرۆکی ئەو دەگرێت و چاوی فەرەنسیی و رۆژئاواییەکانی لەسەر دەبێت، وەک ئەوەی پێی بڵێن: بۆچی ئاواتان پێ کردین؟ بەڕاست ئێوە کێن؟ ئاخۆ ئاینەکەتان رێ بەم جۆرە کارانە دەدات؟). بڕوانە (هاشم صالح: الانسداد التأريخي لماذا

فشل مشروع التنوير في العالم العربي ؟ – دار الساقي، بيروت الطبعة الاولى، ٢٠٠٧ ص ١٤٥).

ئەڵبەت ئەو وەک بیریار و ئەکادیمستێک، بەرانبەر بەو پرسیارانە وەڵامی سەرپێ و حازر بەدەست ناداتەوە و بەنووسینی ستوونێکی ناو رۆژنامەکان، ئەو مەسەلەیە لە کۆڵ خۆی ناکاتەوە، بگرە شێلگیرانە و بەچەند کتێبێک، شوێن ئەو پرسە دەکەوێت و هەوڵدەدات دەست بخاتە سەر سەرچاوەی برینەکان و چاوگی قەیرانەکە ئاشکرا بکات.

"عەبدولوەهاب موئەدەب" لە توونس و لە بنەماڵەیەکی ئاینیی ناسراوی ئەو وڵاتەدا پەروەردە بووە. شاعیر و نووسەر و ئەکادیمیستێکی دیارەو بەزمانی فرەنسایی دەنووسێت. زیاتر لە چل ساڵە لە پاریس دەژی. مامۆستای ئەدەبی بەراوردکارییە لە زانکۆی (نانت) و سەرنووسەری گۆوارێکی نێودەوڵەتییە بەناوی (دیدال). هەروەها لە رادیۆی کولتووری فرەنسا سەرپەرشتی پرۆگرامێک دەکات بەناوی (کولتوورەکانی ئیسلام).

بەو بەشدارییە بەرچاوەی کە لە کایەی رۆشنبیری فرەنسیدا هەیەتی، "موئەدەب" توانیویەتی کەم تا زۆر وەک "محەمەد ئەرکۆن" و "ئەمین مەعلوف" و "تاهیر بن جەلۆن"، خۆی بسەلمێنێت و شوێن دەستی دیار بێت. ئەگەرچی سەرەتاکانی بەشیعر و ئەدەب و عیرفانی ئیسلامی دەست پێ دەکات، بەڵام لە دوای رووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەرەوە، توێژینەوە فیکرییەکانی لە بواری ئیسلام و مۆدێرنە و پرسی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامیدا، زیاتر دەیناسێنن و ناوبانگی بۆ پەیدا دەکەن. گرینگترین کتێبیشی کە دوا بەدوای رووداوەکانی سەر نیویۆرک و واشنتۆن نووسیویەتی و نێوبانگی بۆ پەیدا کرد و ساڵی ٢٠٠٢ خەڵاتی (فرانسوا مۆریاک)ی لەسەر وەرگرت، کتێبی (نەخۆشی ئیسلامە) کە بۆ زیاتر لە بیست زمانی جیاجیای جیهانی وەرگێردراوە.

لەو کتێبەدا "موئەدەب" هەوڵێکی زۆر بەخەرج دەدات، بۆ ئەوەی لە دەرەوەی حوکمی سەرپێیی و شرۆڤەی سادە و ساکار، دەستی بە سەرچاوەی نەهامەتییەکانی جیهانی ئیسلامی بگات و لە هۆکارەکانی ئەو تاوانە زۆر گەورەیە حاڵی بێت کە لە یازدەی سێپتەمبەردا رووی دا. تاوانێک کە بەبڕوای ئەو رەگ و ریشەکانی لە مێژوودایە، نەک تەنیا پەرچەکردارێک بێت لە دژی شاڵاوی رۆژئاواخوازی و بەمەکدۆنالیزەکردنی جیهان.

ئەوەی وا دەکات دید و بۆچوونەکانی "موئەدەب" جیاواز بنوێنن، لە دید و بۆچوونی ئەو عەشاماتە قەڵەم بەدەستەی خۆیان بەداکۆکیکاری ئیسلام و شارستانییەتی ئیسلامی دەزانن، ئەوەیە کە ئەم رەخنەکانی رووی لە ناوەوەیە و لە نووسینەکانیدا، رەخنەی توند ئاراستەی ئەقڵیەتی هاوچەرخی ئیسلامی دەکات. واتە ئەو تەواو لەسەر ئەو قەناعەتەیە کە رەخنەی بێ بناغە، هەمیشە رووی لە دەرەوەیە و ستراتیجی کارکردنی بەو ئاراستەیە کە سەرچاوەی هەموو قەیران و نەهامەتییەکان، بداتە پاڵ ئەوی تر و خۆی لێیان بێبەری بکات. ئەمەش بۆ خۆی ئەرکە ئاسان و بێ سەرئێشەکەی رەخنەیە. لە کاتێکدا رەخنەی جیدی و راستەقینە، لەبری دەرەوە روو لە ناوەوە دەکات و بەر لەوەی ئامبازی ئەوی تر بێت و ئەوی تر تاوانبار بکات، یەخەی خۆی دەگرێت و کێشەکان لەگەڵ خۆیدا یەکلایی دەکاتەوە.

لە دەسپێکی کتێبی (نەخۆشی ئیسلام)دا کە "محەمەد بەنیس" بەناوی (أوهام الاسلام السياسي) کوردوویەتی بەعەرەبی، دەڵێت: (عەرەب و موسڵمانان وا راهاتوون نەهامەتی و ماڵوێرانی ئیسلام بدەنە پاڵ ئەوی دی، هەر بۆیە لەبەردەم دادگای مێژوودا هەموو ئەوانە دەبینین کە لە سەدەی دوازدەهەمەوە دەستیان لەو نەهامەتییەدا هەبووە، وەک: خاچپەرستەکان، پاشان مەگۆل و تورکەکان، هەروەها کۆلۆنیالیزمی فەرەنسی و بەریتانی و دواتریش ئیسرائیل و تا دەگات بە ئیمپریالیزمی ئەمەریکی. ئەم

گریمانەیەش هەرچی نەهامەتییەکە دەیداتە پاڵ ئەوی دی و بەرپرسیاریتی لە کۆڵ خۆمان دەکاتەوە). بڕوانە: (عبدالوهاب المؤدب: أوهام الاسلام الاسياسي نقله الى العربية: محمد بنيس والمؤلف دار النهار، بيروت الطبعة الاولى، ٢٠٠٢).

نووسەرانی وڵاتانی ئیسلامی بەگشتی، خاڵی هاوبەشی نێوانیان بەدرێژایی سەدەی رابردوو تا هەنووکەش، راکردنە لەو بەرپرسیارێتییە و زەقکردنەوەی رۆڵی ئەوی دی بێگانەیە، لە قوولکردنەوەی قەیران و نەهامەتییەکانی جیهانی ئیسلامی. تا دواجار ئەم حاڵەتە دەبێتە پەتایەکی کوشندە و بەڕوونی لە بەرنامە و رەفتار و گوتاری فێندەمێنتالیزمی ئیسلامیدا رەنگ دەداتەوە.

ئەوەی (قاعیدە) لە رۆژی دروستبوونییەوە باسی لێ دەکات و بەکردەوە ئەنجامی دەدات، چییە جگە لە بەرپرسیارکردنی زەق و زۆپی رۆئاوا بەگشتی و ئەمەریکا بەتایبەتی، لە تێکڕای کێشە و نەهامەتییەکانی جیهانی ئیسلامی. بەڵام وەک "عەبدولوەهاب موئەدەب" باسی دەکات، یەکێک لە ئەرکە گرینگەکانی نووسەر (راستکردنەوەی ئەم هەڵە تێگەیشتنانەیە، دەستگرتنی ئەوانەیە کە وا بیر دەکەنەوە تا چاو بکەنەوە و لە خەونی غەفڵەتزەدەیی بەخەبەر بێن).

کەواتە ئەگەر زۆرێکی زۆر سەرچاوەی نەهامەتی و پەتای موسڵمانان و وڵاتانی ئیسلامی بدەن پاڵ دەرەوەی و هێزی ناحەزی دەرەکی، ئەوا "عەبدولوەهاب موئەدەب" بەپێچەوانەی ئەو قەناعەتە باوەوە پێی وایە سەرچاوەی کێشەکان بەپلەی یەکەم خۆمانین. هەر ئەمەش وای لێ دەکات رێک و راست بچێتە ناو بابەتەکە و بەدەنگی بەرز بڵێت: (ئیسلام دوچاری دەردێکی کوشندە بووە، ئێستاش کاتی ئەوەیە دەستنیشانی ئەو پەتایە بکەین و چارەسەری پێویستی بۆ بدۆزینەوە). بڕوانە: (هاشم صالح: الاسلام

و الانغـلاق اللاهـوتي الفـصل الرابـع: عـبـدالوهاب المؤدب: الاسـلام مـريض بالسلفية المتزمتة فمن يشفيه؟ - دار الطليعة، بيروت الطبعة الاولى، ٢٠١٠).

ئەو زیاد لە شـوێنێک جـەخت لەوە دەکات کە (ئەگەر دەمارگـیری دەردی کـاتۆلیکیـیـەت بێت، نازیزمـیش پەتای ئەڵمـانیـا بێت، ئەوا بێگومـان فێندەمێنتـالیزم دەرو بەڵای ئیسلامە). واتە سەرچاوەی نەهامـەتییەکە ئەوەیە کە موسـڵمـانـان خۆیان بەئیسـلامی دەکەن و بەرەو دەخـراون و مـاڵوێرانی زیاتر زۆرتری دەبەن.

شکسـتی ئەو بزاوتە ئەقڵانییـەی جیـهانی ئیـسلامی کە موعتـەزیلەکان سـەرمـەشـقی بوون و خـەلیـفە "مـەئموون" پشـتگیـری لێ دەکرد، ئاڕاسـتـەی مـێژووی جیـهانی ئیسلامی گۆڕی و دید و بۆچوونی حـەنبەلییـەکان شـوێنی گـرتەوە کـە "ئیبن حـەنبـەل" (٧٨٠ -٨٥٥)، نوێنەرایـەتی دەکـرد و خـەلیـفـە "مـتــەوەکـیل"یش گـەورەترین پشـتـیـوانی بوو. بۆ گـەڕان لە بنجـوبنـاوانی ئسـووڵییـەت لە ئیسلامـدا و گرێدانەوەی بەبزاوتـە ئسـووڵییـەکانی ئەمڕۆوە، "عـەبدولوەهـاب موئەدەب" لە دووەم بەشی کـتـێبـەکـەیدا (نەخـۆشـی ئیـسـلام) بەناوی (ژینالۆجیـای فێندەمـێنتـالیزم)، پـرسـی فێندەمێنتـالیـزمی ئیـسلامی لەمڕۆدا وەک حـاڵەتێکی لەناکاو و وەک پەرچەکرداریک لە دژی پڕکێشـەکانی ڕۆئاوا و ئیمـپریالیـزمی ئەمەریکی سـەیر ناکات، بگرە لە سیاقی مـێژوویەکی ماوە درێژدا تاوتوێی دەکات و مەرجەع و ڕەگ و ریشە مێژووییەکانی دیاری دەکات. دیاریکردنی ئـەو هێڵە مـێژوویـەش، سـەرەتاکانی بە "ئیبن حـەنبەل" و دواتر بە "ئیبن تیمیـە" و پاشـانیش بە "محـەمـەد کوڕی عـەبدولوەهـاب" دەست پێ دەکات.

فێندەمێنتالیزمی ئیـسلامی لەمڕۆدا، لەو سـێ سەرچاوەیە ئاو دەخواتەوە و تێزە و تیۆرەکانی ئەمـانە کە دنیـابینی فێندەمـێنتـالیسـتـەکانی سـەردەمی گـلـۆبالیـزمیشن دروست دەکـەن. ئەم سـێ سـەرچـاوەیە بەدرێژایی مـێـژووی

خۆیان، له هەوڵی وێناکردنی ئیسلامێکی پاک و بێگەرد و بان مێژوویيدا بوون، هەمیشە چاویان لەسەر رابردوو بووە (رابردوویەکی دوور) و تاسەی ئەو نموونە ئایدیالییەیان کردووە کە لە مەدینەدا بەرجەستە بووە، لەگەڵ تەسلیمبوونی تەواو بەدەق و جێکردنەوەی واقیع لەناو دەقدا. ئەم پرۆسەیەش وای کردووە ئیسلام وەک ئاین و شارستانییەتێکی گەورە، له سەدەی چواردەمەوە لەسەر شانۆی جیهان پاشەکشە بکات و موسڵمانانیش تەنیا لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە و لەگەڵ لەشکرکێشییەکەی "ناپلیۆن" بۆ سەر میسر، مەسافەی ئەو جیاوازییە گەورەیە لە نێوان خۆیان و ڕۆئاوادا ببینن و لە خەونی قووڵی چەند ساڵەیان بەخەبەر بێن.

ئەمە دۆخێکی دژوار بۆ موسڵمانان دروست دەکات، بەهۆی ئەو پاشەکشە مێژووییانەوە. ئەوان کە سەردەمانێک سەرمەشقی شارستانی بوون و جڵەوی مێژوویان کردبێت، ئێستا بۆیان قوت ناچێت کە دەبینن بوونەتە پاشکۆ و لە کێشە و قەیرانی جۆراوجۆردا نغرۆ بوون.

ناتوانن ئەو دۆخە قبووڵ بکەن کە ئێستا تێیدا دەژین. لەبەر ئەوە دەبینین هەست بەڕق و حەسوودی و تووڕەییەکی زۆر دەکەن لە بەرانبەر ڕۆئاوا و پێیان ئەغزە کە دەبینن، ئەوان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بۆڕیان داونەتەوە. بۆیە هەوڵ دەدەن بەهەر شێوەیەک بووە تۆڵەیان لێ بکەنەوە (بە هەجوکردن یان بە شێواندنی وێنەیان یاخۆ بە تیرۆر و تەقینەوە و توندوتیژی و کاری خۆکوژی).

"عەبدولوەهاب موئەدەب" لە سۆراخکردنی سەرچاوەی قەیران و نەهامەتییەکانی جیهانی ئیسلامی و بەرپرسکردنی ئسوولیەتی ئیسلامی لەو نەهامەتییانە، تەنیا بەوەوە ناوەستێت پەتای ئەم ئسوولیەتە بداتە پاڵ "حەسەن بەننا" و گرووپی (ئیخوان موسلمین) کە لە ساڵی ١٩٢٨ دا دروست

بوون. یان ئەو دەردە کوشندەیە بگێڕێتەوە بۆ چرکەساتی "محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب" (١٧٠٣- ١٧٩١)و تەواو، یان تەنیا ساتەوەختی هاتنی "شێخ لئیسلام" کە نازناوی "ئەحمەد بن تیمیە"یە (١٢٦٣ - ١٣٢٨) بە بەرپرس بزانێت. نەخێر ئەو دەیەوێت بۆ زەمەنێکی مێژوویی دوورتر بڕۆین و بگەڕێینەوە بۆ رۆژگاری مەرجەعی یەکەمی ئسوولیەتی ئیسلامی، لە تایپە هەرە توند و داخراوەکەیدا کە "ئەحمەدی کوڕی حەنبەل"ە (٧٨٠ - ٨٥٥) و دامەزرێنەری مەزهەبی حەنبەلییە کە دۆگماترین و کۆنکرێتیترین مەزهەبە لە ئیسلامدا. بڕوانە: (الاسلام والانغلاق اللاهوتي ل ١٠٩، ١١٠،١١١).

ئەوە "ئەحمەدی کوڕی حەنبەل"ە پێداگیری دەکات لەسەر ئەوەی، دەبێت پابەندی تەواوی دەقی قورئانی بین وەک خۆی، بەبێ هیچ شرۆڤە و لێکدانەوەیەک. هەروەها بانگمان دەکات بۆ ئەوەی پێغەمبەر و هاوەڵانی و گرووپی مەدینە، بکەینە سەرمەشق و نموونەی خۆمان و شوێن پێیان هەڵبگرین لە ژیان و خواپەرستیدا. واتە پێویستە هەموو موسڵمانێک لە هەر سەردەم و زەمانێکدا بژی، دەوڵەتی مەدینە بکاتە نموونەی باڵای خۆی و لێی لانەدات.

ئەم دنیابینییانەی "ئیبن حەنبەل"، دواتر سەر دەکێشێت بۆ ناو نووسینەکانی "ئیبن تیمیە" و "محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب" و تیۆرسینە دۆگماتیسەکانی تری ناو بزاوتە ئسوولییەکانی سەدەی بیستەم. سەرەنجامیش ئەوەی لێ دەکەوێتەوە کە لە ئەفغانستانی سەردەمی تاڵیبان و لە رێکخراوی قاعیدە بینیمان.

دنیابینییەکی لەم جۆرە کارەکتەرێک دروست دەکات، کە لە دەرەوەی مێژوودا بژی و نامۆ بێت بەواقیع و ئەو قۆناغەی تێیدایە. ئەمەش واقیعی حاڵی تەواوی ئەو بزاوتە ئسوولییە ئیسلامییانەیە کە دەیانەوێت، هەموو دنیا بەچاوی ئەوان ببینن و بەئەقڵی ئەوان بیر بکەنەوە. گیرۆدەبوونی جیهانی

ئیسلامی بەم تێزە و تیۆرە دۆگما و بان مێژووییانە، وا دەکات ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو هەڵخلیسکان و نووچدانی زیاتر بڕوات. هەژموون و باڵادەستی ئیمپریالی و کۆلۆنیالی کە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی گرتەوە، هۆکاری دواکەوتن و پاشەکشەی موسڵمانان نەبوو، بگرە بەرەنجامی ئەو دۆخە ناهەموارە بوو کە دید و تێڕوانینی داخراو و نالۆجیکی و وەهمی ئەو کەسانە دروستیان کرد، ئەم پرۆسەیەش توانستی شارستانییەتی ئیسلامی لە هەموو داهێنان و بەرەوپێشچوونێک بێبەری کرد.

## دەرچوون لە نەفرەتێکی ئەبەدی

لە یادی دە ساڵەی یازدەی سێپتەمبەردا و لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ ڕۆژنامەی (لیبراسیۆن)ی فەرەنسایدا، "عەبدولوەهاب موئەدەب" دەڵێت: (لە یازدەی سێپتەمبەردا دزێویی هێزی جیهادیمان لەسەر دەستی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی بینی، کە دەتوانێت چی بکات و تا کوێ بڕوات). بڕوانە: (ڕۆژنامەی المستقبل ژمارە ٤١١٨ بەرواری یەکشەم ٢٠١١/٩/٨).
مەترسی ئەم پڕکێشیکردنەی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی کە (قاعیدە) و هاوشێوەکانی پێی هەڵدەستن، وا دەکات ئەوەندەی تر موسڵمانان لە شەڕێکی بێئامانەوە بئاڵێن و ئیسلام وەک دین و وەک شارستانییەتیش دەردەدارتر بێت. لێرەوە بۆ بەرگرتن بەم مۆدێلە لە فاشیزمی ئیسلامی، پێویستە نوخبەی ڕۆشنبیران و بیریاران بەئەرکی خۆیان هەستن و ڕێ بەو خۆکوژییە دەستەجەمعییە بگرن کە فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی دەیەوێت بیکاتە قەدەری سەرجەم موسڵمانان. بە هەستکردن بەم مەترسییانە و بۆ دەرچوون لە نەفرەتی ئسوولییەتی ئیسلامی کە دەیەوێت ئیسلامی شارستانی بە ئیسلامی بەربەری بگۆڕێت، کەسانێک هەن بەرپرسیارانە هاتوونەتە مەیدان و لە گۆڕینی ئەم بارودۆخەی ئێستا دەگەڕێن.

"عەبدولوەهاب موئەدەب" یەکێکە لەو دەنگانەی دەیەوێت جیهانی ئیسلامی

و موسڵمانان، لەو تونێلە تاریکە بێنە دەرێ. دەیەوێت ئیسلام وەک بارمتەیەک لە دەست ئەو موجاهیدانە دەربێنێ کە تینووی خوێن و مردن و وێرانەین. دەیەوێت ئیسلام لەگەڵ مۆدێرنە و شارستانییەتی تازەدا ئاشت کاتەوە. دەخوازێت ئەو هێڵە فیکرییە لە ئیسلامدا تۆخ کاتەوە کە" ئیبن عەرەبی " و "ئەبوزەیدی بەستامی " و "سەهرەوەردی " نوێنەرایەتیی دەکەن.

لەم پێناوەشدا کۆ لەوە ناکاتەوە کە بە پیتی درشت بنووسێت: (ئەوەی بەلای منەوە گرینگە ئەوەیە رەخنە لە ئاینەکەی خۆم بگرم کە ئیسلامە، بەو شێوەیەی نیچە لە سەردەم و رۆژگاری خۆیدا، رەخنەی لە مەسیحییەت پێ دەگرت). لەم پرۆسەی رەخنەگرتنەشدا دەیەوێت "نیچە" ئاسا، دەست بۆ هەموو شتێک بەرێت و هەموو شتێک بداتە بەر رەخنە، تەنانەت ئەوانەشی پێی دەڵێن (سەوابت). لەم بارەیەوە بۆچوونێکی بەجێی هەیە کە دەڵێت: (پێت دەڵێن دەتوانیت هەرچی هەیە بیڵێیت و دەست بۆ هەموو شتێک بەریت، تەنیا قەرەی سەوابتەکان نەکەویت. ئەم قسەیە مانای ئەوەیە هیچ نەڵێین و هیچ نەکەین، چونکە ئەگەر نەمانتوانی دەست بۆ سەوابتەکان بەرین، واتە ناتوانین هیچ بڵێین و هیچ بکەین).

دەرگاکردنەوە بەرووی رەخنەدا، قسەکردن بەدەنگی بەرز و بەئاشکرا لەسەر کۆی ئەو کێشە مێژووییانەی کەڵەکە بوون، زامنی ئەوەن ئیسلام لە ئاینێکی شەڕانگێز و مەرگدۆست و بەربەرییەوە، بگۆڕێن بۆ ئیسلامێکی ژیاندۆست و شارستانی.

یازدەی سێپتەمبەر چەند کارەساتێکی قێزەون و دزێو بوو، دەکرێت دەرفەتێکیش بێت بۆ بەخۆداچوونەوە. سەرەتایەک بێت بۆ لەبەریەک هەڵوەشانی کەلەپووری ئیسلامی و فەحسکردنی بەچاوێکی رەخنەگرانە. "عەبدولوەهاب موئەدەب" جەخت دەکاتەوە کە ئیسلام وەک هەندێک پێیان وایە سەرچاوەی ماڵوێرانییەکە نییە، ماڵوێرانی و نەهاتییەکە لەوەدایە کە

موسڵمانان خۆیان بەئیسلامی دەکەن. لەو داخرانە ترسناکەدایە کە "ئیبن حەنبەل" دروستی دەکات. لەو تەوقدانی واقیعدایە بە هەمەڕەنگیەکانییەوە لە چوارچێوەی دەقدا کە لای "ئیبن تیمیە" دەیبینین. لە تەرێزکردن لە ژیان و خۆشویستنی مەرگدایە لای "سەید قوتب". لە فەرامۆشکردنی گۆڕان بوون و رەوتی مێژوودایە، لای "محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب". لەو هەولانەدایە کە "بن لادن" و "زەرقاوی "و هاوشێوەکانیان دەیدەن، تا (قاعیدە) و تیرۆر و توندوتیژی بکەنە ناسنامەی تەواوی موسڵمانان و شوناسی ئیسلام.

پرۆژە رەخنەییەکەی ئەم دە ساڵەی "عەبدولوەهاب موئەدەب" هەوڵێکە بۆ بەرگرتن بەهەموو ئەمانە، رێگەگرتنە لە دووبارەبوونەوەی یازدەی سێپتەمبەرێکی تر. نیشاندانی رووبەکی تری ئیسلامە کە عاریفی گەورەی وەک "ئیبن عەرەبی " بەرهەم هێناوە. نەفرەتکردنیشە لەو ئسوولییەی خەریکە ئیسلام لە دینی خواپەرستییەوە، دەکاتە دینی جەنگاوەرە خۆکوژەکان.



# ئایا کێشەکە لە ئیسلامدایە؟

## ئێرشاد مێنگی کێشەکە چۆن دەبینێت؟

---

"دوو شت هەڕەشەی جیدین بۆ سەر ژیانی مرۆڤایەتی: توندڕەوی ئیسلامی و چەکی ئەتۆمی".

ئێرشاد مێنگی

"نەفامی و گەندەڵی و دووڕوویی و جەور و ستەم و داوەشینی مۆراڵی، دیارترین خەسڵەتی کۆمەڵگەی ئیسلامییە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا".

ئەنوەر ئیبراهیمی سەرەک وەزیرانی پێشووی مالیزیا

"موسڵمانانی ئەمڕۆ لە هەموو کەس زیاتر هەژارتر و نەخوێندەوارتر و دواکەوتووتر و دەردەدارتر و مەحرومتر و لاوازترن".

پەروێز موشەڕەفی سەرۆکی پێشووی پاکستان

## ڕەخنەگرتن بە دەنگی بەرز

بە درێژایی دە ساڵی دوای ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر و هەڵکشانی جیهاد و توندوتیژی ئیسلامی لە جیهاندا، لێشاوی نووسین و چاپکردنی کتێب لەسەر ئەو دیاردە و ڕووداوە تراژیدییانە بەردەوامە.. هەریەکەش لە گۆشەنیگا و دنیابینیی خۆیەوە، بەرپرسیارێتی ئەو ڕووداوانە دەداتە پاڵ لایەن و ناوەندێک... زۆرن ئەوانەی خۆرئاوا و ئەمەریکا تاوانبار دەکەن و سیاسەتی ناعادیلانە و پاوانخوازی ئەوان، بەهۆکاری سەرەکی ڕق و تووڕەیی گرووپە ئیسلامییەکان دەزانن، بەڵام لە بەرانبەردا ئەو دەنگانەش کەم نین کە تۆباڵی ئەو تاوان و کارەساتانە دەخەنە ئەستۆی ئیسلام و موسڵمانان.

لە وتاری پێشووماندا و لە بەسەرکردنەوەی کتێبی (أوهام الاسلام السياسي)دا، نیشانمان دا کە چۆن نووسەر و ئەکادیمیستێکی وەک "عەبدولوەهاب موئەدەب" موسڵمانان نەک ئیسلام، بە بەرپرس دەزانێت لەو قەیران و نەهامەتییانەی بەرۆکی جیهانی گرتووە. بەڵام لە کتێبی (کێشەکە لە ئیسلامدایە)، "ئێرشاد مێنگی " بە تۆنێکی تر قسە دەکات و رایەکی جیاوازتر لە بۆچوونەکانی "موئەدەب" دەخاتە ڕوو... "مێنگی " لە رەخنەکانیدا پڕکێشی زیاتر دەکات و ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئیسلام دەستەویەخە دەبێت و پێی وایە، ئەوەی لەمڕۆدا موسڵمانان پێیەوە گرفتارن و تەواوی جیهانیشیان بە قەیران و نەخۆشییەکانی خۆیانەوە دەردەدار کردووە، سەرچاوەکەی ئیسلامە نەک شتێکی تر.

کاتێک لە پایزی ٢٠٠٣ دا و لە وڵاتی کەنەداوە ئەم دیدو بۆچوونانەی بە

کتێبێک بڵاو کردەوە، دەنگدانەوەی گەورەی دروست کرد و لە یەک کاتدا بووە جێی ستایشکردن و سەرکۆنەکردن. هەندێک نازناوی "سەلمان روشدی " کەنەدایان لێناو، هەندێکیش وەک بووقێکی زایۆنیزم و وەک هاوجنسبازێکی ناحەز بەئیسلام و پەیامەکەی وەسفیان کرد.

بەدەر لەوەی "ئێرشاد مێنگی " کامیانە و لە کام بەرەدا دەوەستێت، بەڵام کتێبەکەی لە وتنی هەندێ هەقیقەت و لە دەست خستنە سەر هەندێ برین، مەبەستی پێکاوەو چاوگی کێشەکانی بۆ دیاری کردووین. ئەم خانمە ئانارشیستە هاو جنسبازە (وەکی نەیارەکانی پێی دەڵێن)، بەرەچەڵەک موسڵمانێکی هیندییە و ساڵی ١٩٦٩ لە وڵاتی ئۆگەندا لەدایک بووە، بەڵام دوای سێ ساڵێک واتە لە ساڵی ١٩٧٢و دوای ئەوەی سەرۆکی ئەوسای ئۆگەندا جەنەراڵ "عیدی ئەمین دادا"، بڕیاری دەرکردنی ئاسیاییەکانی دانیشتووی وڵاتەکەی دەدات، خێزانەکەی "مێنگی " روو دەکەنە کەنەدا و لەوێ نیشتەجێ دەبن.

قۆناغەکانی خوێندنی لەو وڵاتەدا تەواو کردووە.. لە زانکۆی (برتش کۆلۆمبیا) زانستە مرۆڤایەتییەکانی خوێندووە و یەکەمی گرووپەکەی بووە. پاشان تێکەڵ بە کاری رۆژنامەنووسی بووە و لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا لە رۆژنامەی (ئۆتاوا ستزن) کاری کردووە، بەوەش بووە بە بچووکترین کچە رۆژنامەنووس لە کەنەدادا. ساڵانێکی زۆریشە ئامادەکار و پێشکێشکاری یەکێک لە بەرنامە تەلەفزیۆنییە بەناوبانگەکانی ئەو وڵاتەیە (QUEER Television)، هەر لە رێی ئەو بەرنامەیەشەوە ناوبانگێکی زۆری بۆ خۆی پەیدا کردووە. بڕوانە: (رضا الا عرجي: سلمان رشدي جديد مهاجرة، هندية الاصل، شاذة جنسيا الاتجاه الآخر ٢٠٠٤/٢/٢١).

"مێنگی " وەک "موئەدەب" بەدەنگی بەرز رەخنە دەگرێت و رەخنەکانیشی وەک ئەو، روو لە ناوەوەیە نەک لە دەرەوە. واتە هەردووکیان کۆکن لەسەر

ئەوەی قەیران و کێشەکانی موسڵمانان و جیهانی ئیسلامی، بەپلەی یەکەم و بەگشتی خۆمان لێیان بەرپرسین و ئۆباڵی ئەوەی روودەدات بەر لە هەرکەس و لایەنێک، بەئەستۆی خۆمانە. ئەوەی ئەم دوو نووسەرە لێک جیا دەکاتەوە ئەوەیە، یەکێکیان موسڵمانان تاوانبار دەکات و رەخنەئاژنی ئەوانە دەکات کە بوونەتە مایەی دەردەدارکردنی ئیسلام و مایەپووچکردنی شارستانییەت و پەیامە ئینسانییەکەی (ئەمە بۆچوونی عەبدولوەهاب موئەدەبە)، بەڵام ئەوی تریان (واتە ئێرشاد مێنگی) دەست لە یەخەی رۆژئاوا و موسڵمانان بەردەدات و رێک و راست ئیسلام وەک ئاینێک، بەرپرسیار دەکات و رەخنەی لێ دەگرێت.

هەر ئەم پرکێشییەشی وادەکات دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی (کێشەکە لە ئیسلامدایە) کە بۆ زیاد لە زمانێکی جیهانی وەرگێڕدراوە، وەکی "سەلمان روشدی " فتوای کوشتنی بدرێت و لێرەو لەوێ هەوڵی تیرۆرکردنی بدەن. شایەنی باسە چاپی عەرەبی ئەم کتێبە لە ئەڵمانیا و لە شاری کۆلن لە دەزگای (الجمل) کە"خالد المعالي" خاوەنیەتی، بڵاو کراوەتەوە و لە زۆربەی ماڵپەرەکانی ئینتەرنێتدا داگیراوە.

ئەم کتێبە لە پێشەکییەک و نۆ بەش پێکهاتووە، لە شێوەی نامەیەکی کراوەدا نووسراوە و ئاراستەی سەرجەم موسڵمانانی دنیا کراوە. وەکی لە دووەم دێری سەر بەرگی دەرەوەی کتێبەکەشدا دەڵێت: (ئەمە بانگەوازێکە بۆ سەرجەم موسڵمانان، بە مەبەستی بێداربوونەوە لەپێناو راستی و گۆڕانکاریدا).

## کێشەکە لە کوێدایە؟

وەکی لە سەرەتادا ئاماژەمان پێ دا، ئەم کتێبە وەک کتێبگەلێکی تر بەرهەمی دنیای دوای یازدەی سێپتەمبەرە. مەبەستی سەرەکی نووسەرەکەشی، ئاشکراکردنی هۆکارەکانی ئەو رووداوە تیرۆریستییە و

دەستنیشانکردنی سەرچاوەی کێشەکانە.

"ئێرشاد مێنگی" لەو پێشەکییە کورتەیدا کە بۆ کتێبەکەی نووسیوە، بەدەنگی بەرز و بێ پێچ و پەنا دەڵێت: (ئێمە لە قەیراندایین و تەواوی دنیاش بەدوای خۆماندا پەلکێش دەکەین). واتە ئەم وەکی "سەید قوتب" و تیۆرسینەکانی تری (قاعیدە) و بزاوتە جیهادییەکانی تری وڵاتانی ئیسلامی، نایەت بڵێت: (رۆژئاوا لەسەر ئاستی ژیاری و مۆراڵی مایە پووچ بووە و هەنووکەش موسڵمانان بەئەرکی خۆیانی دەزانن، جڵەوی رابەرایەتیکردنی مرۆڤایەتی بگرنە دەست و ئەو لادانە مێژووییە راست کەنەوە کە رووی داوە). نەخێر ئەو دەیەوێت وەکی خۆی دەڵێت: (لە دوو پەتای کوشندەی موسڵمانان رزگاری بێت کە خۆخەڵەتاندن و فیز و لووتبەرزییە). واتە دەیەوێت هەقیقەتی شتەکان وەکی خۆیان ببینێ و خاکییانە دەست و پەنجەیان لەگەڵدا نەرم بکات. ئەو ئەگەر بەچاوی بیریار و لێکۆڵیارێکی پسپۆڕیش سەیری واقیعی جیهانی ئیسلامی نەکات و وەک رۆژنامەنووسێک ئەو کارە بکات (بەڵام رۆژنامەنووسێکی پرۆفێشناڵ)، ئەوا دەتوانێت ئەو قەیرانە کوشندە و ئەو کێشە و گرفتە قووڵانە ببینێت کە وڵاتانی ئیسلامی بەدەستیانەوە دەناڵێنن.

ئەم وەک" حەسەن بەننا" و" سەید قوتب" و"مەودوودی " و " بن لادن"، جیهان بە نەخۆش و ئیسلام بەپزیشک و فریادڕەسی ئەو دەرد و بەڵایانە نابینێت. دنیا بەتاریکستان و ئیسلام وەک نووری رووناکی سەیر ناکات.. ئەو دەیەوێت لە دەرەوەی ئەم وەهم و خۆشخەیاڵییەوە، واقیعی موسڵمانان خۆیان و واقیعی دەرەوەشیان ببینێت. کێشەکە بۆ هەر دەبێت لەوانیتردا بێت و سەرچاوەی قەیرانەکان دەرەوە بن بەتەنیا. ئەوەتا لەلاپەڕە پێنجدا بە تەوسێکەوە دەنووسێت: (ئەوە بۆ دەبێت هەر ئێمە لەسەر هەق بین و ئەوانی تر هەموویان رەگەزپەرست بن؟). ئەم پرسیارە هەزاران هەزار موسڵمانی

دەمارگیر و دۆگما توورە دەکات، بەڵام بۆ دەبێت لەناو ئەم واقیعە مێژووییە ئاڵۆزەی دنیادا، موسڵمانان بێ هەڵە و بێ گوناه و مەعسووم بن.

"مـــێنگی " نایەوێت تـووڕەیی و تـوندوتیـــژی ئیـــســــلامی تـەنیـــا وەک پەرچەکـردارێکی رووت، لە بەرانبـەر ڕۆئاوا و بەجـیـهـانی بوونی مـۆدێلی سـەرمـایەداریدا لێک بداتەوە.. خۆکوژی و کاری تیرۆریـستی مـوسـڵمـانان، هەر بەتەنیا بە داگیرکردنی خاکی فەڵەستین لەلایەن ئیسرائیلەوە شرۆڤە بکات. ئەو دەیەوێت لەگەڵ ئەم هەقیقەتانەشدا کە لە واقیعدا هەن، ژێرخانی فیکری و ئایدیۆلۆجی و عـەقائیـدییەش ببینێ کـە دنیـابینیی ئەو مـرۆڤـانە دروست دەکەن.

"مێنگی " لە رێی ئەزموونی ژیانی خۆیەوە وەک کچە موسڵمـانێک و وەک خوێندکارێکی مـوسـڵمـان، دێتە سـەر باسی ئەو فـەزا ترسناکـەی مـرۆڤی موسـڵمـانی تێدا پەروەردە دەبێت. فـەزایەک کە وەک ئەو دەڵێت: (ستراتیجی کارکردنی برێتییە لە بە کەم سەیرکردنی رەگەزی مێ و سـووکایەتیکردن بە کەمایەتییە ئاینەکانی تر).

بەشـێکی گـەورەی ئەم کـتێبـەش لەسـەر رەخنەکردنی ئەم دوو دنیـابینی و مـــامـــەڵەکـردنە نادروســـتـــە راوەســـتـــاوە... ئـەو پێی وایـە لە کـــۆمـــەڵگە ئیسلامییەکاندا، لە مـاڵدا کار بـۆ پەراوێزخسـتن و رق لێبوونەوە لە رەگـەزی مێ دەکـرێت و لـە خـوێندنگە ئاینی و حـوجـرەکـانیـشـدا جـوولەکـە و شـوێنکەوتووانی ئاینـەکانی تـر، سەرزەنشت دەکرێن و تانەیان لێ دەدرێت و وەک کەسانی گومڕا و ناقۆڵا سەیر دەکرێن.

"ئێرشاد مێنگی " لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا بەناوی (كيف أصبحت مسلمة رافضة) دەڵێت: (سالانی خوێندنم لە خوێندنگەی ئاینیدا، پرسیارێک کـە سـەرقـاڵی کـردبووم جـوولەکـە بوو. چونکە هەمـیـشـە باس دەکـران و مـامـۆسـتـاکـەمـان زۆر بەجـیـدی پێی دەوتـین: جـوولەکـە کـەسـانێکن پارە

دەپەرستن نەک خـوا. بۆیە هـەر موسـڵمـانێک قـەرمیان بکەوێت و تێکەڵیـان بێت، ئیمـانی سـەلامەت نابێت.. جوولەکە هەمیشـە خەریکی پیلانگێڕین و نیازیان تێکدانی دنیایە).

پەروەردەکـردنی مـرۆڤ بـەم جـۆرە، تا تەرێز لـەوی تر بکـات و شـوناسـی مـرڤـبـوونـی لێ بسـەنێـتـەوە و کـەلێن لـەبەردەم تێکەڵبـوون و پێکەوەژیاندا دروست بکات، دنیایەکی بێ مـتمانەیی و پڕ کێشـە و ململانێ دەخولقێنێ. کـەڵەکـەبوونـی ئەم رقــە لە پای پـەروەردەیەکی ئاینـی بەرنـامــە بۆ داڕێژراو، سـەرەنجـام لەشکرێک لەو خۆکوژانـە دروست دەکات کە لە کـەمـترین کـاتدا زۆرترین مرۆڤکوژی دەکـەن، وەک ئەوەی لە (واشنتۆن و نیـویۆرک و مەدرید و لەندەن و دوورگـەکانی بالی)دا بینیمـان. دواتر بـەوپەڕی خـوێن سـاردییـەوە دەڵێن جا چییە، خۆ ئەوانەی کوژران کەسانی (مولحید و بێباوەڕ و جوولەکە بوون).

کێشـەی جیهانی ئیسـلامی لەوەدایە بچووکترین زوڵم و ناهەقـی ئیسرائیل و ئەمەریکا و ڕۆژئاوا دەبینـێ، بەڵام لە ئاست زوڵم و سـتـەمی تاڵیبان لە ژنـانی ئەفـغـانسـتـان و قـەدەغـەکـردنی کـۆلارە هـەڵدان و گـوێگرتن لە مـیـوزیک و سـەیرکـردنی تیـڤـیـدا بێـدەنگ دەبێت. "مـحـەمـەد عـەتـا" و هـاوڕێکانی گـەر مێشکیان بـەو هـەموو دۆگمـایە پڕ نەکرایە و رۆحـیان بەو هـەموو رقە ئالوودە نەبوایە، نەیاندەتوانی بە کـەماڵی ئیسـراحـەتەوە تاوانێکی لەو جـۆرە ئەنجـام بدەن.

"ئێـرشـاد مـێنگی " بـاس لەوە دەکـات کـە لە دوای رووداوەکـانی یازدەی سـێپـتـەمبەر، وڵاتـانـی ئیسـلامی بۆ خۆ دەربازکردن لەو رووگیرییـەی تووشـی هاتن، کـەوتنە پـەیام ناردن بۆ وڵاتـانی دنیـا. پەیامــەکـەشـیـان ئەم رسـتـە سـەرێیی و حازر بەدەسـتـەبوو کە خاڵی بوو لە هـەموو بەرپرسـیـارێتییـەک، رستەکەش ئەمە بوو: (ئێـمە هـەمووـمـان تیرۆرست نین، هـەمـوومـان قـاعیـدە و

بن لادن نین). له بری هەموو خۆ رەخنەکردن و دادگاییکردنێکی ئەو مێژووە ناشیرین و پڕ شەڕانگێزییەی هەمانە، بەم رستەیە ویستمان خۆمان لە هەموو هەوڵێک بۆ بەخۆداچوونەوە و بۆ راکردن له هەموو بەرپرسیارێتیەک بدزینەوە.

دەبوو یازدەی سێپتەمبەر دەرفەتێک بووایە، بۆ ئەوەی واز لەو فیز و لووتبەرزییە بێنین کە گوایە جیهان قەرزارباری موسڵمانانە و موسڵمانان قەرزارباری کەس نین. دەبوو دەرفەتێک بووایە بۆ وشککردنی ئەو سەرچاوەی رق و شەڕانگێزییەی مێژوویەکی درێژە لە وڵاتانی ئیسلامیدا، کاری لەسەر دەکرێت و گەورە دەکرێت. ئەو کولتووری نالێبوردەییەی ملیۆنان موسڵمانی پێ گۆش دەکرێت، دنیا دەکاتە گۆڕەپانی شەڕێکی بێ ئامان. ئەو شەڕەی رۆژبەڕۆژ رووبەڕووی بەرفراوانتر دەبێت و لە قاهیرە و خەرتووم و جەزائیر و سۆماڵ و یەمەن، بەرەو کابول و جاکارتا و ئیسلام ئاباد و ئەستەنبوڵ سەر دەکێشێت، تا دەگاتە یەک بەیەکی وڵاتانی ئەوروپایی و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

بەبڕوای "مێنگی" ئێمە ئەگەر ئازایەتی ئەوەمان تێدا نەبێت سەرچاوەی کێشەکان دیاری کەین و هۆکاری نەهامەتییەکان ببینین، ئەوا ئەم قەیران و ماڵوێرانییەی ئێستا هەر درێژەی دەبێت. کۆتاییهێنان بەم هەلومەرجە دژوارە بە هەڵهاتن نابێت لە هەقیقەتە تاڵەکان، بگرە بەرووبەڕووبوونەوەیان دەبێت. لێرەوە رەخنەکردنی قورئان و لەسەر وەستانی هەندێ ئایەت کە پاساو و بەهانە دەداتە دەست گرووپە توندڕۆکان تا کاری نادروست بکەن، بەکارێکی هەنووکەیی و پێویست دەزانێت. بەتایبەتی ئەو ئایەتانەی رەواج بەتوندوتیژی و ئافرەتزکردن و سڕینەوەی ئەوی تر دەدەن. ئەو ئایەتانە لە زۆر قۆناغی مێژوویدا و بەتایبەت لەگەڵ هەڵکشانی بزاوتە جیهادییەکانی ناو ئیسلامی سیاسیدا، مامەڵەیەکی تەواو پراگماتیکانەیان لەگەڵ کراوە و لە سیاقی مێژوویی خۆیان دەرهێنراون، بۆ شەرعیەتدان بەهەندێ پرۆسە کە

خۆیان مەبەستیان بووە.

بەکورتییەکەی "مێنگی" جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئیسلام وەک ئاینی موسڵمانان، بێبەری نییە لەوەی ئێستا روو دەدات. بەشێکی ئەو شتانەی کولتووری ئێمە بەرهەمی دێنێ، سەرچاوەکەی ئیسلامە. خۆدزینەوە لەم راستییە وا دەکات هەرگیز دەستمان بەچارەسەرێکی کۆنکرێت نەگات. لە راستیشدا کەڵەکەبوونی ئەم قەیران و کێشانە لە مێژوویەکی دوور و درێژی ئیسلامەوە تا ئەمرۆ، هۆکارەکەی خۆلادانە لەو هەقیقەت و دەست پارێزیکردنە لەوەی بەچاوێکی رەخنەگرانەوە، سەیری قورئان و مێژووی ئیسلام بکرێت. تەواو وەکی ئەوەی ئەوروپاییەکان لەگەڵ بزووتنەوەی ریفۆرمی ئاینی و رێنیسانس و رۆشنگەریدا، دەستیان پێ کرد.

## سوپاس بۆ رۆژئاوا

بەپێچەوانەی زۆرێک لە موسڵمانان کە راهاتوون بە سەرکۆنەکردن و نەفرەتکردن لە رۆژئاوا، "مێنگی" سوپاسی خوا دەکات کە رۆژئاوای پێ بەخشیوین. رۆژئاوا وەک سەرزەمینێک کە مرۆڤ دەتوانێت بە ئازادی مومارەسەی مرۆڤبوونی خۆی تێدا بکات، لانی کەم لەو شتانەی پێوەندیان بە مافی هاووڵاتیبوون و بیرکردنەوەی ئازاد و رادەربڕینەوە هەیە.

ئەسکی نۆیەمی کتێبەکەی ئەمە ناونیشانەکەیەتی: (سوپاس بۆ خوا کە رۆژئاوای پێ عەتا کردووین). "مێنگی" پێی وایە ئەو فەزایەی لە خۆرئاوا هەیە، دەکرێت بکرێتە دەرمەتانێک بۆ موسڵمانان تا بەشێوەیەکی ئازایانە و ئازادانە بیر لە واقیعی حاڵی خۆیان و وڵاتەکانیان بکەنەوە و چارەسەر بۆ کێشە و قەیران و گرفتەکانیان بدۆزنەوە. هەر ئەمەشە وا دەکات لەم کتێبەیدا برێکی زۆری بەرپرسیارێتی ریفۆرم و گۆرانکاری لە ئیسلامدا، بخاتە ئەستۆی ئەو موسڵمانانەی لە رۆژئاوا دەژین. ئەو پێی وایە ئەوانە جگە لەوەی ئازادانە بیر دەکەنەوە و دوورن لە هەڕەشە و مەترسی هێزە

کۆنەخوازەکان و گرووپە جیهادییەکان، دەشتوانن لە ئەکادیمیا و دامەزراوە زانستییەکانی ڕۆژئاوا بەهرەمەندبن و بەشێوەیەکی لۆجیکی و ئەخلاقی، خەریکی تاوتوێکردنی مێژووی ئیسلام بن و ڕەخنە لە ئاینەکەی بگرن.

لە ئێستادا ڕۆژئاوا بووەتە ئەو جێگەیەی کە مۆدێلێکی نوێی لە ئیسلام تێدا لەدایک بێت، ئەویش مۆدێلی ئیسلامی ئەوروپاییە. ئەم مۆدێلە زۆر جیاوازە لەو مۆدێلە تەقلیدی و داخراو و دۆگمایەی، مێژوویەکی درێژە لە وڵاتانی ئیسلامیدا بەرقەرارە. مۆدێلێک کە سەرەنجام بە بەرهەمهێنانی، قاعیدە و تاڵیبان و بزووتنەوەی حەقانی و تەوحید و جیهادی "ئەبو موسعەب زەرقاوی " گەیشت.

پێشتر "ئێدوارد سەعید" پشت ئەستوور بە ئەکادیمیایی ڕۆژئاوای و بەچەمک و کەرەستە فیکرییەکانی ئەقڵی ڕۆژئاوا، توانی لەو فەزا ئازادەدا دەست بداتە ڕەخنەگرتنێکی هەمە لایەن لە گوتار و سیاسەت و دنیابینیی ڕۆژئاوا، لە بەرانبەر جیهانی دەرەوەی خۆیدا.. ئەم پرۆژەیەشی بەدرێژایی سیساڵی ڕەبەق، بە کەماڵی ئیسراحەت لە ڕۆژئاوا و لەناو جەرگەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەگەڕ خست، هەندێ (جوولەکە و کۆنسێرڤاتیزمی توندڕۆ و دەمارگیر نەبێت)، کەس بە بەکرێگیراوی ڕۆژهەڵات و ئیسلام تاوانباری نەکرد و فتوای ڕۆحکێشانیان لە دژی نەدا.

ڕۆژئاوا وەکی "مێنگی " دەڵێت: (ئەو جوگرافیایەیە کە دەتوانین چەشنەی ئازادی تێدا بکەین. من بۆ خۆم قەرزارباری ئەمەریکای باکورم کە هەناسەی ئازادی تێدا هەڵدەمژم. لە زۆربەی زۆری وڵاتانی ئیسلامیدا ئەگەر خوا لە چارەی نەنووسیبێت وەک ئەوان بیت، ئەوا بەچاوێکی کەمتر لێت دەڕوانن، بەڵام لێرە لە ئەمەریکای باکور موسڵمانان لە ئازادییەکی زۆر بەهرەمەندن و ئەم ئازادییەش نەک بۆ ئەوان، بگرە بۆ خەڵکانی هەمەجۆر و هەمەڕەگەز فەراهەمە. من بۆ خۆم ئەگەر هەنووکە لە وڵاتێکی ئیسلامیدا بژیامایە، لانی

کەم لە ناخی خۆمدا دەبوومە کەسێکی بێباوەڕ، بەڵام لەبەرئەوەی لەم کونجەی دنیادا دەژیم و دەتوانم بیر بکەمەوە و جیاوازبم و بەناخی هەر بابەتێکدا بمەوێت ڕۆبچم، فێر بووم کە بۆچی نابێت لە ئیسلام نائومێد بم).

با ئێمەش لێرە لە ڕۆژئاوا ببینە "دایلا لاما و مارتن لۆتەر کینگ و دیسمۆند توتۆو مالکۆم ئەکس"، ئەو مرۆڤانەی توانییان خۆیان و ئاینەکەیان لە خۆنمایشکردن وەک قوربانییەک ڕزگار بکەن. ئێمەی موسڵمانانیش لە ڕۆژئاوا دەتوانین، ئەو کارە بکەین و ببینە سەرمەشقی دروستکردنی گۆڕانکاری. ئێمە دەتوانین ئەوە بکەین، ئەوەش هەر تەنیا بە سەرکۆنەکردنی فاشیزمە ئیسلامییەکان تەواو نابێت، بگرە بەگژاچوونەوەی ئەوانەشی دەوێت کە بەردەوام لە هەوڵدان گرێی دۆنیەت لای موسڵمانان قوڵتر کەنەوە و کراسی قوربانی بکەنە بەری موسڵمانان و ئەرکی قورسی گۆڕانکاریش بدەن بەسەر شانی ئەوانی تردا. ئێمە پێویستمان بەومیە ئەقڵیەتی خۆیەقوربانی نیشاندان، لە ناخماندا ریشەکێش بکەین.

دواجار وەکی "مێنگی" دەڵێت: (بۆ ئەوەی جارێکی تر بێینەوە ناو مێژوو و لە کاروانی شارستانییەتی مرۆڤایەتی دوانەکەوین، پێویستە بەجورئەتەوە باس لە کێشە و قەیرانەکانی خۆمان بکەین. جورئەت و ئازایەتی ئەوەمان تێدا بێت بڵێین کێشەکە لە خۆماندایە نەک ڕۆژئاوا، نەخۆشییەکە لە ئیسلام و موسڵماناندایە، نەک ئیسرائیل و ئەمەریکا).



# ڕێکخراوی قاعیده

## له "عەبدوڵڵا عەزام"ەوە بۆ "ئوسامە بن لادن"

---

"القتل والقتال ضرورة مفروضة علي المسلمين، إنهم يحملون راية التوحيد، وهم مأمورون بنشرها فوق كل رابية وسهل، والضرورة تقدر بقدرها".

عبدالله عزام، في الجهاد (آداب وأحكام)

## سەرەتا لە ئیخوانەوە

ساڵی ١٩٦٨ بۆ ڕۆژئاوا بەگشتی و بۆ ئەوروپاییەکان بەتایبەتی چۆن ساڵێکی ئاسایی نەبوو، بۆ وڵاتانی ئیسلامیش ساڵی ١٩٧٩ ساڵێکی تایبەت و جیاواز بوو. جیاواز بەو ڕووداو و گۆڕانکارییانەی ئەو ساڵە لەگەڵ خۆیدا هێنایی و مێژووی ناوچەکە و جیهانی بەشێوەیەکی تر داڕشتەوە.

وڵاتانی ئیسلامی لە کۆتایی حەفتاکاندا لەگەڵ دوو ڕووداوی گرینگدا ڕووبەڕوو بوون، لەلایەک سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران و لەلایەکی تریش لەشکرکێشی سوپای سووری سۆڤیەت بۆ سەر ئەفغانستان و داگیرکردنی ئەو وڵاتە لەلایەن یەکێک لە زلهێزەکانی دنیاوە.

سەروەختێک ئەم ڕووداوانە ڕوویان دا، تەمەنی ئیسلامی سیاسی خۆی لە نیو سەدە دەدا (١٩٢٨ -١٩٧٩)... گۆڕانکارییە تازەکانی ناو تاران و کابول، ئیسلامی سیاسی ژیاندەوە، یان ڕوونتر بڵێین تەماحی زیاتری بەردەست خست تا بەخۆی بکەوێت. لەلایەک بۆ دووبارەکردنەوەی ئەزموونی شۆڕشی ئێرانی لە شوێن و جێی تردا، لەلایەکی تریش بۆ تاقیکردنەوەی سیاسەت و ستراتیج و پلان و بەرنامەی تر، لە کابول و ناوچە جیاجیاکانی ئەفغانستاندا.. لە کاتێکدا بەهۆی زیاد لە هۆکارێکەوە دووبارەکردنەوەی ئەزموونی ئێرانی، لە وڵاتانی تری ئیسلامی و بەتایبەتیش لە وڵاتانی عەرەبیدا ئەستەم بوو، زۆرێکی زۆر لە گرووپە ئیسلامییەکان (بەتایبەت ئیخوانەکان و گرووپە جیهادی و ئسوولییەکان)، لە سەرەتای هەشتاکانەوە ڕوویان لە ئەفغانستان کرد. بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە بکەنە مەڵبەندی جیهاد و خاڵی دەسپێک، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتی کوفر و هێزە ئیمپریالیستەکان.

بەهۆی هەلومەرجی سیاسی جیهانی لەو قۆناغەدا کە ئەوجی جەنگی ساردی نێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوو، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ تۆڵەکردنەوەی شکستەکانی خۆی لە ڤیتنام و تەنگ هەڵچنین بە پرکێشییەکانی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا، لە ڕووی دارایی و سەربازی و لۆجستییەوە، کەوتە یارمەتیدانی گرووپە چەکدارییە ئیسلامییەکانی ئەفغانستان و بەهۆی هاوپەیمانێتی وڵاتێکی وەک پاکسانیشەوە، کەوتە زەمینەسازی بۆ ڕاکێشان و پەلکێشکردنی زیاتری ئەندامانی ئەو گرووپە ئیسلامییانەی وڵاتانی عەرەبی کە خواستی جیهادکردنیان لە ئەفغانستاندا هەبوو. نەک هەر ئەوەندەش بگرە ئەو پرۆسەیەیان بە واجبێکی شەرعی دەزانی.

ئیخوان موسلمینەکان بەهۆی گەورەیی و ئەزموونی مێژووی خۆیانەوە، یەکەم دەستە و تاقمێک بوون کە بەوردی چاودێری بارودۆخی تازەی وڵاتی ئەفغانستانیان دەکرد. کە زانییان ئەمەریکا و پاکستان و عەرەبستانی سعودیە، بۆ بەرگرتن بەرژێمە کۆمۆنیستەکەی کرملین ئامادەی یارمەتی و کارئاسانیکردنن، بۆ ئەو دەستە و تاقمانەی دەیانەوێت شان بەشانی ئەفغانییەکان سەنگەر لە لەشکری سۆڤیەتی بگرن. ئیخوان موسلمین بە بەرنامەیەکی ورد کەوتە خۆ و لە سەرەتای هەشتاکاندا، شێخ "عەبدوڵڵا عەزام"ی فەڵەستینیان ڕاسپارد کە بۆ جیهاد و بۆ بەهاناوەچوونی موجاهیدانی ئەفغانی، ڕوو لە پاکستان بکات و پێوەندی لەگەڵ گرووپە چەکدارەکانی ئەفغانستاندا دروست بکات.

ئەوەبوو لە نیسانی ساڵی ١٩٨٦دا "عەبدوڵڵا عەزام" بەفەرمانی ڕاستەوخۆی ئیخوان موسلمین، توانی یەکەم سەربازگەی مەشق و ڕاهێنان بەناوی "عرین الاسد" لەناو خاکی ئەفغانستاندا بکاتەوە. بەکردنەوەشی ئەو شوێنە بوو بە مەڵبەندی کۆکردنەوە و دیسپلینکردنی تەواوی ئەو کەسانەی، لە وڵاتانی جیاجیای ئیسلامییەوە ڕوویان لەوێ دەکرد (بەتایبەتیش لە

ولآتانی عەرەبییەوە). ئەم لەشکرە گەورەیەی لێرەدا کۆ دەکرێتەوە و مەشق دەدرێت و بە عەرەبە ئەفغانەکان ناو دەردەکەن، بەردی بناغە و هەنگاوی یەکەمە بۆ دروستبوون و هاتنە ئارای ئەو ڕێکخراوە تیرۆریستییەی، دواتر لە ژێرناوی ڕێکخراوی (قاعیدە)دا خۆی بەیان دەکات و ئاسایشی جیهان دەخەنە مەترسییەوە.

## "عەبدوڵڵا عەزام" بە کوێ گەیشت؟

"عەبدوڵڵا عەزام" ساڵی ١٩٤١ لە گەڕەکی (الشهوانة)ی گوندی (سیلة الحاثیة)ی سەر بە پارێزگای (جەنین)، لە وڵاتی فەلەستین لەدایک بووە. لە تەمەنی سێزدە ساڵیدا و لە ڕێی "شەفیق ئەسعەد عەبدولهادی "یەوە کە لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی ئیخوان بوو لە گوندەکەیاندا، دەچێتە ریزی ئەو ڕێکخراوەوە. لە ساڵی ١٩٦٤ کە "شەفیق ئەسعەد عەبدولهادی " کۆچی دوایی دەکات، "عەبدوڵڵا عەزام" شوێنی دەگرێتەوە. لە سەرەتادا کاریگەری زۆری شێخ "حەسەن بەننا"ی ڕابەر و دامەزرێنەری ڕێکخراوی ئیخوان موسلمینی لەسەر بووە، هەروەها وەکی خۆشی باسی دەکات کەسانێکی تریش هەبوون کە مامۆستای بوون و زۆر شتیان لێوە فێر بووە: (سەید قوتب لە ڕووی فیکرییەوە و ئەبوحەسەنی نەدەوی لە ڕووی فقهەوە و ئیبن تیمیە لە بواری عەقیدە و ئیبن قەیمیش لە ڕووی ڕووحییەوە). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (عبدالرحیم علي: تنظیم القاعیدة عشرون عاما.. و الغزو مستمر موسوعة الحرکات الإسلامیة ، مرکز المحروسة للنشر والخدمات الصحفیة والمعلومات، القاهرة الطبعة الاولی ، ٢٠٠٧ ل ل٢٨٩، ٢٩٥).

دوای ئەوەی لە شەڕی شەش ڕۆژەی عەرەب ئیسرائیلدا، کەرتی ڕۆژئاوا بەتەواوەتی لەلایەن ئیسرائیلییەکانەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت، "عەبدوڵڵا عەزام" لەگەڵ خێزانەکەیدا ڕوو دەکەنە وڵاتی ئوردون. لە سەرەتای حەفتاکاندا چەند جارێک سەردانی سعودیە و میسر دەکات، لە میسر لە

رێی پێوەندی لەگەڵ قوتبییەکان و ئیخوانییەکانی ئەوێ، بڕوا بەوە دێنێت کە پێویستە لە رێی زانکۆوە کار بۆ بە ئیسلامیکردنی کۆمەڵگە بکات. لە ساڵی ١٩٧٣ بۆ ساڵی ١٩٨٠ لە کۆلێجی شەریعەوە ئەو پرۆسەیە دەست پێ دەکات، تا دەسەڵاتدارانی ئوردون درک بە مەترسییەکانی دەکەن و لە سەرەتایی ساڵی ١٩٨٠ بەبڕیارێکی سەربازی، کۆتایی بەڕاژەکەی دێنن و لە زانکۆ دووری دەخەنەوە.

بەڵام هەر زوو لە رێی ئیخوانی نێودەوڵەتییەوە، لە زانکۆی شا عەبدولعەزیز لە شاری (جدة)ی سعودیە دادەمەزرێت و لەوێ پێوەندی لەگەڵ "کەمال سەنانیری " دەگرێت. "سەنانیری " یەکێکە لە سەرکردە دیارەکانی دەزگای تایبەتی ئیخوان موسلمین و لەو سەردەمەدا بەرپرسی دۆسیێی جیهاد بووە لە ئەفغانستان. هەر زوو "سەنانیری " داوا لە "عەبدوڵڵا عەزام" دەکات بەنوێنەرایەتی ئیخوان موسلمین، ڕوو لەو وڵاتە بکات و پلانی ئەوان جێبەجێ بکات کە بریتییە لە پێشوازیکردن و داڵدەدانی ئەو گەنجانەی لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییەوە روو لەوێ دەکەن. "عەبدوڵا عەزام"یش دەست بەجێ و بێ هیچ دوودڵییەک، داواکارییەکە قبووڵ دەکات و دەچێتە پاکستان.

بە رێنمایی ئیخوانەکان، دەبوو "عەبدوڵڵا عەزام" هێزێکی جیهادی چەکداری کاریگەر دروست بکات کە ساز و ئامادە بێت. بۆ ئەوەی یارمەتی هەر گرووپ و لایەنێکی موسڵمان بدات کە لەلایەن ستەمکارانەوە زوڵمیان لێ بکرێت و بچەوسێنرێنەوە، بەتایبەت لەو وڵاتانەدا کە موسڵمانان کەمینەن. بڕوانە: (هـ.س.پ).

کاتێک "عەزام" دەستی بە پلانەکەی کرد لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٦دا، ژمارەی ئەو گەنجانەی لەگەڵیدا بوون لە پەنجەکانی دوو دەست تێپەڕیان نەدەکرد، بەڵام ساڵێک دوای ئەوە ژمارەیان گەیشتە سەد و بیست چەکدار.. زۆرێک لە شارەزایانی بواری ئیسلامی سیاسی وەک "ئۆلیڤێ روا" و "گی سورمان"و "کەمال تەویل" و "نەبیل شەرەفەدین"و "د. ضیا ء رەشوان"،

ئەوە بەیەکەم هەنگاو بۆ دروستبوونی ڕێکخراوی قاعیدە دادەنێن.

"عەزام" لە ساڵانی ئیشکردنیدا تا سەرومختی تیرۆرکردنی، باوەڕی زۆر و نەگۆڕی بە ڕۆڵی ڕاگەیاندن هەبوو بۆ مۆبیلیزەکردنی گەنجان و ئامادەکردنیان، بۆ جیهاد و گەیشتن بەو مەرامەی خەونی پێوە دەبینێ (کە ئەویش گەیشتن بوو بە زیندووکردنەوەی دەوڵەتی خەلافەت و قاعیدەشی بەرێگای گەیشتن بە دەوڵەتی خەلافەت دەزانی). لەم پێناوەشدا کۆواری (جیهاد)ی دەرکرد کە کۆوارێکی مانگانە بوو. ئەڵبەت ئەم کۆوارە لەو قۆناغەدا، ڕۆڵێکی کاریگەری دەبێت و پەلکێشی گەنجانێکی زۆر دەکات بۆ بەرەکانی جەنگ لە ئەفغانستان.

"عەبدوڵڵا عەزام" وەک یەکەمین ڕابەر و دامەزرێنەر و تیۆرسینی ڕێکخراوی (قاعیدە)، لە نێوان ساڵانی ١٩٨٧- ١٩٨٨ هێڵە گشتییەکانی کارکردنی ڕێکخراوی (قاعیدە) دادەڕێژێت و بەیاننامەی دامەزراندنەکەی گەڵاڵە دەکات، بەڵام بەهۆی کێشە و قووڵبوونەوەی ناکۆکییەکانی لەگەڵ "ئوسامە بن لادن"دا، ڕۆژی هەینی ٢٤/ تشرینی دووەمی / ١٩٨٩ لە (پیشاوەر) لەلایەن لایەنگرانی "بن لادن"ەوە تیرۆر دەکرێت. دە ساڵ دوای ئەم تیرۆرکردنە "محەمەد سادق" یەکێک لە کەسایەتییە دیارەکانی (قاعیدە)و دوای دەستگیرکردنی، لەلای ئەمەریکاییەکان و پاکستانییەکان دان بەوەدا دەنێت کە: (بن لادن ڕاستەوخۆ فەرمانی تیرۆرکردنی عەبدوڵڵا عەزامی داوە و لەسەر بڕیاری ئەو تیرۆرکراوە، لەبەرئەوەی گومانی هەبووە کە مامۆستاکەی پێوەندی بە C.I.A هەبێت و دەستی لەگەڵیاندا تێکەڵ کردبێت).

هەر چۆنێک بێت تیرۆرکردنی "عەبدوڵڵا عەزام"، کۆتایی بە قۆناغێک لە مێژووی عەرەبە ئەفغانەکان و ڕێکخراوی قاعیدە دێنێت و لە دوای مردنی ئەوەوە، قۆناغێکی نوێ لە مێژووی ئیسلامی جیهادی و ڕادیکالیدا دەست پێ دەکات.

ڕاستە چ "عەبدوڵڵا عەزام" و "بن لادن" کۆک و هاوڕا بوون، لەسەر

دروستکردنی ڕێکخراوێکی جیهادی بۆ داکۆکیکردن لە موسڵمانان و بەگژداچوونەوەی کافران، بەڵام لە ڕووی شێواز و تاکتیکی کارکردنەوە جیاواز بوون. ئەوانەی لە دوای ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەرەوە، بە ئایدیا و مەرجەعی فیکری و شێوازی کارکردنی ڕێکخراوی (قاعیدە)وە خەریکن، لەگەڵ "سەید قوتب و مەودوودی و ئەیمەن زەواهیری و ئەبو حەفسی میسری و ئوسامە بن لادن"دا، ناتوانن باز بەسەر "عەبدوڵلا عەزام"دا بدەن و ڕۆڵی ئەو لە مێژووی ئەو ڕێکخراوەدا نادیدە بگرن.

ئێمە دەتوانین بۆ تێگەیشتن لە شێوازی بیرکردنەوە و ئاشنابوون بەدنیابینییەکانی "عەبدوڵلا عەزام"، هەردوو کتێبی: (في الجهاد أداب وأحكام) لەگەڵ (الهجرة والاعداد)، بکەینە ڕێبەر و بزانین کە چۆنچۆنی بیری کردووەتەوە و ستراتیجی بۆ کاری داهاتووی ئیسلامی سیاسی چۆن بووە.

ئەگەر لای تیۆرسینێکی پەرگیری وەک "سەید قوتب"، چەمکی سێنتراڵ (تەکفیر و جاهلیەت) بێت، ئەوا سەرەکیترین وتەزایەک لەناو ئەدەبیاتی "عەبدوڵلا عەزام"دا (جیهاد)ە، (جیهاد) بە پیتی درشت و بۆ ئەم مەبەستەش نامیلکەیەکی تایبەتی هەیە و بەدرێژایی ئەم بیست ساڵەش، لەگەڵ (معالم في الطريق)ی "سەید قوتب" و سەرچاوەگەلێکی تایبەتی تردا، مانیفێست و زادی فیکری و ئایدیۆلۆجی ڕێکخراوی قاعیدە و هاوشێوەکانی بووە لە جیهاندا.

## "عەبدوڵلا عەزام"و نەخشەڕێی تازەی ئیسلامی سیاسی

جگە لە پاکستان، تا ساتەوەختی جیهادی ئەفغانی، ئیسلامی سیاسی وڵاتانی عەرەبی جوگرافیا و پێگەی بوو. هێزێکی لۆکاڵی سنووردار بوو. بەڵام لە سەرەتای هەشتاکانەوە قۆناغێکی تازە بۆ جموجۆڵی ئیسلامییەکان دێتە پێش، عەرەبە ئەفغانەکان تایتڵی دیاری ئەم قۆناغەن و هەر ئەوانیشن دەبنە سەرچاوەی لەدایکبوونی (قاعیدە).. ئەگەر لە بیست ساڵی یەکەمی تەمەنی ئیسلامی سیاسیدا (١٩٢٨ -١٩٤٩)، نەخشەڕێی ئەو قۆناغە

"حەسەن بەننا" وەک ڕابەر و دامەزرێنەر و تیۆرسینی ئیخوان موسلمین داینابێ و دوای ئەویش "سەید قوتب" دیارترین مەرجەع و تیۆرسینی گرووپە جیهادییەکان بووبێت، ئەوا لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردووەوە "عەبدوڵڵا عەزام" ئەو ڕۆڵە دەگێڕێت. نەخشەڕێی ئەو قۆناغە تازەیە بەبڕوای ئەو، سەرەتاکانی بەدروستکردنی ڕێکخراوێکی ئیسلامی نێودەوڵەتی چەکدار دەست پێ دەکات، دۆخی جیهانیش لەو سەردەمانەدا لەبار بوو بۆ هێنانەدی ئەو خەونە...

"عەبدوڵڵا عەزام" هەر زوو درکی بەوە کرد کە هەڵکەوتەی جوگرافی وڵاتێکی وەک ئەفغانستان، لەبارترین جێگەیەکە بۆ دروستکردنی دەوڵەت لەناو دەوڵەتدا.. لێرەوە جگە لە کۆکردنەوەی گەنجانی وڵاتانی ئیسلامی کە ڕوویان لە وڵاتی ئەفغانستان دەکرد، ئەرکێکی تری ئەوەبوو کە مێردمنداڵان و لاوانی ئەفغانستان خۆیان، لەسەر بنەمای وەهابییەت پەروەردە بکات و لەم کارەشیدا کەم تازۆر سەرکەوتوو دەبێت. ئەو تیرۆر و توندوتیژییەی ساڵانێکە ڕێکخراوی (قاعیدە) لە جیهاندا پەیڕەوی دەکات، فیکر و ئایدیۆلۆجیای تەکفیری و توندوڕەوی زیاد لە تیۆرسین و مەرجەعێکی ئسووڵی ئیسلامی لەپشتە، یەکێک لەوانە تێزە و تیۆرەکانی "عەبدوڵڵا عەزام"ە.

"عەزام" یەکێکە لەوانەی بەدەنگی بەرز و بێ پێچ و پەنا هاوار دەکات و دەڵێت: (ئێمە تیرۆریستین، پێویستە هەموو موسڵمانێک تیرۆریست بێت.. تیرۆر بە دەقی قورئان و حەدیس فەرز و واجبێکە لەسەر موسڵمانان). لێرەوە و بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونەی ئایەتی (٦٠) لە سورەتی (ئەنفال) وەک بەڵگە دێنێتەوە کە دەڵێت: (وأعدوا لهم ماأستطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم). کەواتە بەپێی ئەم ئایەتە بێت وەک "عەبدوڵڵا عەزام" جەختی لێ دەکاتەوە: (تیرۆر و تۆقاندن فەرزە، تیرۆرکردن و تۆقاندنی دوژمنان و ناحەزانی خوا واجبە.

ئەگەر (مەشخەڵی ڕێ) بۆ زیاد لە چارەکە سەدەیەک، (مانفێستی)

سەرجەم گرووپە جیهادی و توندڕۆکانی میسر و وڵاتانی تری ئیسلامی بوو بێت، ئەوا دەکرێت بڵێین نامیلکەی (في الجهاد)ی "عەبدوڵڵا عەزام" لەگەڵ (الهجرة والعداد)، بۆ عەرەبە ئەفغانەکان و بۆ لەشکرە سەرەتاییەکانی رێکخراوی (قاعیدة)، زادی فیکر و نەخشەڕێی نوێ بوون بۆ کارکردن. ئەو نەفەسەی نامیلکەی (دەربارەی جیهادی) پێ نووسراوە، نەفەسێکە لێوانلێو لە رق و تووڕەیی و هاندانی زۆر بۆ کوشتن و پەلاماردان و سڕینەوەی ئەوانی تر.

"عەبدوڵڵا عەزام" لە دەسپێکی بابەتەکەیدا، رێک و راست دەڵێت: (جیهاد واتە شەڕ و کوشتن، ئەمەش مەسەلەیەکە هەر چوار فەقیهەکە هاوڕان لەسەری). بڕوانە: (الدكتور الشهيد عبدالله عزام: في الجهاد أداب وأحكام دار ابن حزم، بيروت ل٥). سەروەختێکیش ئەم پەیامە بەگوێی ئەندامانی قاعیدە و عەرەبە ئەفغانەکاندا دەدات، پێیان دەڵێت کە ئامانج لەو جیهادە جیاکردنەوەی ماڵی ئیسلامە لە ماڵی کوفر، ئێمە بۆ ئەوە هاتووین سۆراخی ماڵی ئیسلام بکەین. ئەو پێی وایە لە ساڵی ١٤٩٢ ساڵی لەدەستدانی (غەرناتە)وە، جیهاد فەرز و واجبە و ئەرکی ئێمە ئەوەیە بست بەبستی خاکی ئیسلام ئازاد بکەین و بیدەینەوە دەست موسڵمانان.. کاری ئێمە لە ئەفغانستاندا تەواو نابێت، دوای ئەفغانستان فەلەستین و دوای فەلەستین فلیپین و دوای ئەویش تەواوی ئەو سەرزەمینانە دێت کە ڕۆئاوا و ئەورووپاییەکان، زەوتیان کردووە و بەتۆبزی لە موسڵمانانیان بردووە.

ئەڵبەت ئەم پلان و خەون و خەیاڵانەی "عەبدوڵڵا عەزام"، تا ئەو کاتەی خۆی لە ژیاندا دەبێت هیچی بەچاوی خۆی نابینێ، بەڵام دە ساڵ دوای لە دنیا دەرچوونی و لەسەردەستی "ئوسامە بنلادن" و "ئەیمەن زەواهیری "و ئەندامانی رێکخراوی قاعیدە، ئەو شەڕ و جیهادە لە ئەفغانستانەوە دەگوازنەوە بۆ تەواوی وڵاتانی دنیا . بێگومان هەڵتۆقینی دەوڵەتێکی داخراو و توندڕۆی وەک تاڵیبان لە ئەفغانستاندا، کارئاسانی زۆری بۆ جێبەجێکردن

و به ئەنجامگەیاندنی پلان و بەرنامەکانی (قاعیدە) کرد.

لە نامیلکەی دووەمیدا (الهجرة والاعداد)، "عەبدوڵڵا عەزام" زۆر لە دید و بۆچوونەکانی "سەید قوتب" نزیک دەبێتەوە، بەتایبەت لەو بۆچوونانەی کە لە (معالم في الطريق وهذا الدين والمستقبل لهذا الدين)دا هاتووە. "عەزام" وەک "سەید" پێی وایە، جیهادکردن بۆ بەرقەرارکردنی حاکمیەتی یەزدان لەسەر زەوی و گەیشتن بە (دار الاسلام)، پێویستی بەبڕینی چەند قۆناغێک هەیە، لەوانە: (کۆچکردن و خۆجیاکردنەوە لە کۆمەڵگەی جاهلی و پەناگرتن لە خەڵک و خوای ئەو شوێنانە، پاشان خۆسازدان و ئامادەباشیکردن. دوای ئەوەش قۆناغی پەلاماردان و شەڕ و کوشتار دێت، لە دژی هەموو ئەوانەی لە ماڵی کوفردان و کار بە یاسا و شەریعەتەکانی ئیسلام ناکەن).

ئەڵبەت "عەبدوڵڵا عەزام" تەواوی ئەو شتانەی لە ماوەی هەشت ساڵدا کرد (١٩٨١ - ١٩٨٩)، لە ڕووی ڕێکخستن و پەروەردەکردن و تەیارکردنی ئەو کەسانەی بە مەبەستی جیهاد ڕوویان لە کابول و خۆست و جەلال ئاباد کردبوو. دوای تیرۆرکردنیشی ئەم میراتییە جێ دێڵێت بۆ کەسانێکی تر کە رەنگە "زەواهری " و "بن لادن" ، لە دیارترین کارەکتەرەکانی بن.. بەردی بناغەی ڕێکخراوی (قاعیدە)، ڕێکخراوی ئیخوانی نێودەوڵەتی و فەلەستینییەکی وەک "عەبدوڵڵا عەزام" دایدەنێن، پاشان جێ دەمێنێت بۆ سعودییەکان و میسرییەکان.

## "ئوسامە بن لادن" و ئیعلانکردنی (قاعیدە)

"بن لادن" ساڵی ١٩٥٣ لە باوکێکی بەڕەچەڵەک یەمەنی و دایکێکی بەرەچەڵەک سووری، لە شاری (ریاز)ی عەرەبستانی سعودیە لەدایک دەبێت. لە دوای ساڵی ١٩٧٩ و سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران و پەلاماردان و داگیرکردنی کەعبە لەلایەن "جوهەیمان ئەلعوتەیبە"یەوە، "بن لادن"و زۆرێک لە گەنجان وڵاتی سعودیەیان هان دا بکەونە ژێر کاریگەری

هزری سەلەفی وەهابییەوە. کاتێکیش یەکەتی سۆڤیەت پەلاماری وڵاتی ئەفغانستانی دا و داگیری کرد، "بن لادن" لە ریزی پێشەوەی ئەو گەنجانەدا بوو کە ڕوویان لەو وڵاتە کرد، ئەم ڕووداوەش خاڵی وەرچەرخانی گەورەی ژیانی ئەو دەبێت.

سەرەتا لە پاکستان دەگیرسێتەوە بۆ یارمەتیدان و نزیکبوونەوە و ئاشنایەتی پەیداکردن لەگەڵ گرووپە ئیسلامییە چەکدارەکانی ئەفغانستان، هاوکات خانەیەکیش دەکاتەوە بەناوی (بیت الانصار) بۆ پشتیوانیکردن لەو کەسانەی بە نیەتی جیهادکردن روو لە وڵاتی پاکستان و ئەفغانستان دەکەن. لەم سەروبەرندەدا پێوەندی لەگەڵ "عەبدوڵلا عەزام"دا دەگرێت و وەک ئەو، دروستکردنی گرووپێکی چەکداری ئیسلامی جیهانی خەریکی دەکات.

ئەو سەرەتایەی "عەبدوڵلا عەزام" لە هەشتاکانەوە تا کشانەوەی سۆڤیەت لە ئەفغانستان دروستی دەکات، کێشە و ململانێی نێو گرووپە چەکدارەکانی ئەفغانستان لەناوخۆیاندا، بەئاویدا دەدات و کاریگەری خراپی لەسەر عەرەبە ئەفغانەکان و ئەو ڕێکخستنە تازەیەی (قاعیدە) دەبێت. لە سەرەتای نەوەدەکانیشەوە تا هاتنە سەرکاری بزووتنەوەی تاڵیبان، جۆرێک لە پەرتبوون و دابڕان لە نێوان عەرەبە ئەفغانەکان و ئەندامانی قاعیدەدا دروست دەبێت.. لە کاتێکدا هەندێکیان دەگەڕێنەوە وڵاتەکانی خۆیان وەک: (میسر و جەزائیر و یەمەن و سوودان)، هەندێکی تریان روو لە وڵاتانی ڕۆئاوا دەکەن. ئەوانەی کە دەمێننەوە، هەندێکیان لە ئەفغانستان و پاکستاندا ئۆقرە دەگرن و هەندێکی تریشیان لەگەڵ "ئوسامە بن لادن" و "ئەیمەن زەواهیری "دا، روو لە وڵاتی سوودان دەکەن و "حەسەن تورابی " گەورە هاوپەیمانی "عومەر حەسەن بەشیر"، بۆ چەند ساڵێک لەو وڵاتەدا داڵدەیان دەدات.

رەنگە سەرکەوتنی بزووتنەوەی تاڵیبان لە ئەفغانستان، گەورەترین دەرووپەک بێت کە لە "بن لادن" و "زەواهیری " و سەرجەم عەرەبە ئەفغانە هەڵاتووەکانی تر کرابێتەوە و چاکترین دەرفەتێکیش بووبێت، بۆ ئەوەی ئەو

گرووپە خەونەکانی خۆیان و خەونی کەسانی وەک "عەبدوڵڵا عەزام" بێننەدی. لەگەڵ هاتنی تالیباندا، رۆژی ١٩٩٦/٨/١٩ "ئوسامە بن لادن" و "ئەیمەن ئەلزەواهیری"، لەگەڵ ١٢٥ کەس لە لایەنگرە دڵسۆزەکانیان، روو لە ئەفغانستان دەکەن و لەلایەن تالیبانەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێ دەکرێت و لە باشووری وڵاتدا، ناوچەیەکی سەربەخۆیان دەدرێتێ و خودموختاری خۆیان دەبێت.

لەم سەروبەندەدا و بەپشتیوانی راستەوخۆی "مەلا محەمەد عومەر"ی رابەری بزووتنەوەی تالیبان، وەک سەرەتای بووژانەوەی رێکخراوی (قاعیدە)، "بن لادن" سەربازگەی (فارووق) دروست دەکات، تا عەرەبە ئەفغانەکان خولی دووەمی کار و چالاکییەکانیان لەو وڵاتەدا دەست پێ بکەنەوە.. ئەڵبەت لە نێوان ساڵانی ١٩٩٦ -٢٠٠٠، دە هەزار موجاهید روو لە ئەفغانستان دەکەن و پەیوەندی بە ریزەکانی (قاعیدە)وە دەکەن. پشت ئەستوور بەم هێزە و بەو هەلومەرجە تازەیەی هاتووەتە ئاراوە، مانگی شوباتی ساڵی ١٩٩٨ لە رێی بەیاننامەیەکەوە (بەرەی جیهانی بۆ بەگژاچوونەوەی یەهوود و ئەمەریکاییەکان)، بەشێوەیەکی فەرمی رێکخراوی (قاعیدە) وەک رێکخراوێکی جیهادی سەلەفی ئیسلامی، خۆی ئیعلان دەکات و بەیاننامەکەش واژۆی ئەم کەسانەی لەسەر دەبێت:

١- "ئوسامە بن لادن" لە عەرەبستانی سعوودیە.

٢- "ئەیمەن ئەلزەواهیری " سەرکردەی رێکخراوی جیهادی میسری.

٣- "رەفاعی تەها ئەحمەد" سەرۆکی ئەنجوومەنی شورای کۆمەڵی ئیسلامی لە میسر.

٤- "مونیر حەمزە" سکرتێری کۆمەڵەی زانایانی پاکستان.

٥- "فەزڵ رەحمان" ئەمیری بزووتنەوەی جیهاد لە بەنگلادیش.

ئەوان لەو بەیاننامەیەدا بەڕوون و رەوانی ستراتیج و بەرنامەی کاری

خۆیان بەیان کردبوو. واتە بەڕاشکاوی رایانگەیاندبوو کە دەست لە هیچ ناپارێزن و بۆ خاتری سەندنەوەی هەقی زوڵملێکراوانی وڵاتانی ئیسلامی، هەموو رێیەک دەگرنەبەر.

لە کۆتاییەکانی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٩٨دا کەناڵی (C.B.A) ئەمەریکایی، چاوپێکەوتنێک لەگەڵ "ئوسامە بن لادن"دا ئەنجام دەدات و لە یەکێک لە پرسیارەکاندا پێی دەڵێن: (ئێوە هانی موسڵمانان دەدەن بۆ کوشتنی ئەمەریکاییەکان لە هەر شوێنێک بێت، مەبەست لەمە تەنیا لەشکر و سەربازانی ئەمەریکایە یان کەسانی سڤیلیشە؟)، لە وەڵامدا "بن لادن" دەڵێت: (ئێمە جیاوازی لە نێوان کەسێکدا ناکەین بەرگی سەربازی پۆشیبێت، لەگەڵ یەکێکی تردا کە جلی مەدەنی لەبەردابێت، ئێمە هەردووکیان دەکەینە ئامانج. ئەو مەدەنییانەی زانیاری لەسەر گەنجانی موسڵمان کۆ دەکەنەوە و دەیدەنە باڵیۆزخانەکەیان، وەک سەربازێک مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین و هەرکەسێک دەستی هەبێت و کارئاسانی بۆ کوشتن و عەزیەتدانی گەنجانی موسڵمان بکات، دەیکەینە ئامانج و لەناوی دەبەین).

بێگومان ئەم فتوا و بەیاننامەیەی "بن لادن" و رێکخراوی (قاعیدە)، تەنیا قسەی سەرکاغەز و بۆ چاوترسێنی نەبوو، بگرە رەنگدانەوەی دنیابینی ئەو گرووپە و کارەکتەرە سەرەکییەکانی بوو. پەیامی "سەید قوتب" و "مەودوودی" و " عەبدوڵڵا عەزام"و تەواوی ئەو کەسانە بوو کە بەیاننامەکەیان واژۆ کردبوو.

ئەگەر "سەید قوتب" رابەری ئایدۆلۆجیای دابڕان بێت لەگەڵ رۆژئاوا و ئەو کەسە بێت کە کەلێنی نێوان جیهانی ئیسلامی و رۆژئاوا قووڵتر دەکاتەوە، ئەوا "ئوسامە" و رێکخراوی (قاعیدە)، ئەو هێزەن کە لە هەوڵی ئەوەدان تێزە و تیۆرەکانی "ساموئێل هنتگنتۆن" لەبارەی پێکدادانی شارستانییەتەکانەوە، تەرجەمە کەن بۆ سەر ئەرزی واقیع و جیهان لە توندوتیژییەکی بێئامانەوە بگلێنن. ئەم پرۆسەیە لە (نایرۆبی و دارلسەلام و بالییەوە) درێژ دەبێتەوە بۆ

(مەدرید و لەندەن و مۆسکۆ)، تا لە سێشەمی رەش و لە پەلاماردانەکەی سەر شاری نیۆیۆرکدا لە یازدەی سێپتەمبەری ٢٠٠١ دەگاتە ترۆپک. لە سەدەی بیستەمدا مرۆڤایەتی گیرۆدەی پەتای فاشیزم و نازیزم و کۆمۆنیزم بوو، بەراییەکانی سەدەی بیست و یەکیش بەدیوەزمەی تیرۆر و بەلای کوشتوبڕی ڕێکخراوی (قاعیدە) دەستی پێ کرد، ئەو ڕێکخراوەی دەیویست لە ئەشکەوتە تاریکەکانی (تۆرابۆرا)وە دنیا بگۆڕێت.

ئەگەرچی جەنگی دژەتیرۆر بەڕابەرایەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی، توانی گورزی گران لە (قاعیدە و تاڵیبان) بوەشێنێ و کۆتایی بەدەسەلاتی "مەلا محەمەد عومەر" بهێنێ ، بەلام زۆری نەبرد چ تاڵیبان و چ قاعیدە بە کارەکتەری تر و بە ستراتیجی ترەوە گەڕانەوە.. ئەوەی دوای پرۆسەی ئازادی لە عێراق بینیمان لەسەر دەستی "ئەبو موسعەبی زەرقاوی " و "ئەبو ئەیووبی میسری "و "ئەبو عومەری بەغدادی"، یان (P.T.T) واتە بزووتنەوەی تاڵیبان لە پاکستان، نیشانی دا ئەم هێزانە چەند مایەی هەڕەشە و مەترسین بۆ سەر ژیان و بۆ سەر مرۆڤایەتی.. مەترسی ئەم هێزانە تەنیا و تەنیا بۆ ڕۆئاوا و بۆ ئەوروپاییەکان و ئەمەریکاییەکان نییە، بگرە بۆ تەواوی دنیایە.

دوای رووخاندنی حکوومەتەکەی تاڵیبان و راوەدوونانی ئەندامانی (قاعیدە) و کوشتن و دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆریان، دواجار نۆرە هاتە سەر ئەو پیاوە کاریزمییەی سالانێکی زۆرە ئەمەریکاییەکان بەدوایەوەن، تا لە سەرەتای ئەم مانگەدا و بە کەمترین زیان لە شاری (ئابوت ئاباد)، کۆتایی بە ژیانی "ئوسامە بن لادن" هات. بە مردنی ئەم پیاوەش رەنگە کۆتایی بەڕێکخراوێکی وەک (قاعیدە) نەیەت، بەلام بێگومان کۆتایی بە قۆناغێک دێنێت کە تایتڵ و ناونیشانی دیاری "بن لادن" بوو.

بە تیرۆرکردنی "عەبدوڵلا عەزام"، سەرەتایەکی تازە لە مێژووی (قاعیدە) دەستی پێ کرد، ئاخۆ بە کوژرانی "ئوسامە"ش سەرەتایەکی تر لە ژیانی

ڕێکخراوەیی (قاعیدە)دا دەست پێ دەکات؟ بێگومان قۆناغێکی تر دێتە پێشێ، بەلاّم کەس نازانێ ڕەنگ و ڕوخساری ئەو قۆناغە چۆن دەبێت و بە چ ئاڕاستەیەکدا دەڕوات.

دەبوو لەم نووسینەدا مادامەکی قسە لەسەر ڕێکخراوێکی وەک (قاعیدە)یە، کەم تا کورتێک باسم لە پێگە و ڕۆڵی کەسێکی وەک "د. ئەیمەن ئەلزەواهیری " بکردایە، لەبەرئەوەی ڕۆڵی ئەم پیاوە هیچی لە ڕۆڵی "عەبدوڵلا عەزام" و "ئوسامە بن لادن" و "ئەبو لەیسی لیبی " کەمتر نییە، بەلاّم بۆ خۆم و بەئەنقەست ئەم کارەم کردووە و دەمەوێت لە داهاتوودا، بە وتارێکی سەربەخۆ و بە نووسینێکی تایبەت، باس لە ڕۆڵ و پێگەی ئەو بکەم و شوێندەستی ئەو لەسەر سیاسەت و کردەوەکانی ڕێکخراوی (قاعیدە) نیشان بدەم.

ئەمەریکاییەکان وان، ئەوروپاییەکان ئیرەییان پێ دەبەن، ڕۆهەڵاتییەکان خانەگومانن لێیان. مارکسیستەکان هەجوویان دەکەن و لە هەر کوێ بێ وەک گەورە هێزی ئیمپریالیستی ناویان دێنن. ئیسلامیستەکانیش پەلاماریان دەدەن و وەک شەیتانی گەورە سەیریان دەکەن. ئەمەریکاییەکان ئەو راستییانە دەزانن، بەڵام هیچ کات وەک دوای ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر، لەسەر ئەو پرسە نەوەستاون و پرسیاری "بۆچی رقیان لێمانە؟" یان بەجیدی نەگرتووە.

شتێک کە وا دەکات هەمیشە رەخنە و تووڕەیی و رق و گلەییەکان ڕوویان لە ئەمەریکا بێت، ئەوەیە کە ئەمەریکا وڵاتێکی مەزنە و بگرە یەکەمین هێزەی گەورەی دنیایە. هەر ئەمەش وای لێ دەکات هەرچی گۆبەن و خراپەکاریی دنیا هەیە، بدرێتە پاڵ ئەو و ئەو بە بەرپرسیار بزانرێت لێیان.

کاتێک لە شوێنێکی سەر گۆی زەویدا کارەساتێک دەقەومێ و ئەمەریکا خۆی تێ هەڵدەقورتێنێ، دەبێتە هەرا و زەنایەکی گەورە و باس لە هەژموونی ئەمەریکا و ئیمپریالیزمی ئەمەریکایی دەکرێت. کە پەناش دەگرێت و هەقی کێشەیەکی نابێت، دەکەوێتە بەر رێژنەی رەخنە و گلەیی ئەوەی لێ دەکرێت کە وەک گەورەترین هێزی دنیا، بە ئەرکی خۆی هەڵناستێت.


ISBN 978-9933-487-22-5

بایی ٢٢٥٠ دینارە